نەژاد عزیز سورمێ

# تاڤگەی مەند و ئەوانی تر

دیوان

**شیعر - کۆلاژ**

**چاپی یەکەم - 2005**



* نەژاد عزیز سورمێ
* **تاڤگەی مەند** و ئەوانی تر- دیوان/شیعرو کۆلاژ
* ئەم چاپە 4 کۆشیعر دەگرێتەخۆ:
1- ئەو شەوانەی خەوم نایێ- 1977- چاپخانەی (النعمان) نەجەف.
2- تاڤگەی مەند- 1987 چاپخانەی شەفیق-بەغدا.
3- چەند کۆتەڵێکی جەنازەیی - 1995- دهۆک.
4- هەندێ لەو شوێن پێیانەی بەسەر شەختەدا مابوونەوە-2005 -چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی حکوومەتی کوردستان- هەولێر
* کۆلاژەکانی ناوەوە لەو پێشانگایانە وەرگیراون کە شاعیر لەساڵی 1995ـەوە بەدوا وەک یەکەمین هەوڵی ئەم چەشنە هونەرە لە کوردستان پیشانی داوە.
* بەرگ و دەرهێنانی هونەری: شاعیر خۆی
* نووسینی سەر بەرگ: محەمەد زادە
* جێبەجێ کردن ونەخشەسازی: شکار نەقشبەندی-سەنگەر حوسێن
* چاپی یەکەم: 2005
* ژمارەی سپاردن: 33
* چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی حکوومەتی کوردستان - کوردستان-هەولێر

ئەی شیعر..!
ئەی دادڕەسی زەمانی بەدنیهادی؛
زەمانی ژەهر
زەمانی دژواریی و
هەموو زەمانەکان..

ئەی شیعر..!
ئەی سیلەی هەموو ڕوگەکان..!
ئەوەتا دەمبینی ڕوو لە تۆ دەکەم.
ئەوەتا هەموو کۆشک و باڵەخانە بەرزەکان
بەچوارداختێکی تۆ نادەم..

ئەی شیعر.. ئەی سیلەی هەموو ڕوگەکان!
من لە ڕۆژێکی ڕەشانگی گوڕەی هاوین لەدایک بووم
تۆ نەبای،
لە چزووی غەمزەیەکدا دەمردم..
ئەی تەمەنی هەڵوەدا!
سیلەی ڕوگەو پەرستگاکان
دادڕەسی زەمانی بەدنیهادی..
ئەی شیعر...!




# ئەو شەوانەی خەوم نایێ!

**کۆشیعری یەکەم – 1977**
**چاپخانەی (النعمان) نەجەف**

پێشکەشە بە دایکم! کە چەند ساڵە نەمدیوە!! – 1977



*«لە چڵەپۆپەی کارەساتەکانماندا...*
*بەدرێژایی رۆژێ...*
*لەبەر ئاوێنە دادەنیشت،*
*قژە زەردە زێڕینەکەی دادەهێنا*
*لە چڵەپۆپەی کارەساتەکانماندا...»*

**ئاراگۆن**
**لە هۆنراوەی**
**ئێلزا لەبەر ئاوێنەدا**

# لەپەراوێزی
# ورێنەی ئاوارەیەکی شێتدا

(سەکۆ) گیان!
چاوەکانی تۆ
هەر لە خۆوە خومارن، دڵەکەم!!
تۆ کە بێداریشی، کەزیەکانت
وەکو کەزیی کیژێکی برا کوژراو پەشۆکاو و
تێکئالاون...



ـ (هەموو ساتێ،
کە سەیری (سەکۆ) دەکەی،
دەڵێی تازە لە خەو هەستاوە!!

سەکۆ وەکو کچانی تر نییە..
بە پرچ شێوان، بێ ڕەنگ ببێت!!
کە بسک و کەزیەکانی دەگەڵ پەرچەم، تێکدەئالێن...
ئاگر لە هەناوان بەرئەدا!!)

چاوان هەڵێنە گیانە..!
چیتە خەو لە چاوەکانت نابێتەوە؟!
دەهەستە!
گیانە دەبەس خۆت بگەوزێنە و
کەلەکان بگۆڕە!!
ئەوێستا ، دەستە خوشکەکانت..
دەگەڵ هاوڕێکانی من..
دەچنە ئەو مێرگانە و جێمان دێڵن!!

ـ (سەرە بەهاری هەموو ساڵێک
شوان و بێری، وێکڕا دەچوونە سەیران..
دەچوونە مێرگەکانی پاڵ شارەگوندەکەمان
بەرخۆڵەکانیان دەگیای بەردەداو
خۆشیان لە ڕەشبەڵەکدا شەهید دەکرد!!
(من)و (سەکۆ)ش:
لە ساڵان، لە مانگان..
ئەو ڕۆژە دەچووینە ژوان..
تا ئێستا:
کە نەورۆزە و/ چڵەکان سەوز ئەچنەوە و/
گوڵە حاجیلەکان بە بەر شەماڵ مەستن/
سەکۆ دەنوێ..



کاتێکیش،
شلکە ڕێواسە بن بەردۆکەکان دەبڕێنەوە و/
شکارتە توتنەکان کارتە دەکەن و/
وەختی مازووچنین دادێ../
ئەوسا سەکۆ چاو هەڵدێنێ!!)

که سەکۆ چاو هەڵدێنێ.. پەشیمانە!
که دڵەکەم چاو هەڵدێنێ.. پەشیمانە!
دەمگوشێ..
دەمکوشێ..
دەمکوژێ!!
ماچم دەکات و ماچم ئەداتێ..





چۆن دڵم دێت لێ بگەڕێم،
هەتاو بتبات؟
چۆن دڵم دێت گیانەکەم؟
من کێم هەیە؟
من کێم هەیە لە شەوگارە کپەکانا بێتە خەونم؟!
لە تۆ زیاتر من کێم هەیە؟



کێم خۆش دەویست؟
ئەوە دەڵێی، لە سەرە بەهاردا
خەرمانی دڵەکەمی دایە دەم ڕەشەبا؟
ئەوە دەڵێی گیانە؟
یا ئەو زەردەواڵەی بۆ (هەنگوین)
پاسەوانی لێ دەکردم؟

بڵێ گیانە! کێم خۆش دەویست؟
(شەو) نەبێت کە چاوەکانت،
تێدا دەبوون بە ئەستێرە..
(شەماڵ) نەبێت،
بسکی دەکردی بە باوەشێن و
نەیدەهێشت، ژێر چەناگە و مەمەکانت ئارەق بکەن...
بڵێ گیانە کێم خۆش دەویست؟
(باران) نەبێت، کە هەمیشە،
کاکۆڵی ئاڵۆزاوی تۆی دەهۆنییەوە..
لە تۆ بەدەر کێم خۆش دەویست؟
تۆ لێرەش سێبەریت و
لە قرچەدا دەمپارێزی..
تۆ دەزانی..؟

تۆ لێرەش سێبەریت و
دڵەکەم بیابان دەکەی..
وەک چۆن هەتاویش بووی،
لە سڕەدا ئەتپاراستم..

ئای گیانەکەم گەر ئەتزانی،
ئەو کاتەی پەڵە هەورەکان دادەکشێن و
نامەی تۆم بۆ دەبارێنن...
چیم لێ دێت؟!
ئای گیانەکەم گەر ئەتزانی،
چەندە تینووم!
گەر ئەتزانی،
خۆری چاوت لە دڵمدا
هەرگیز، هەرگیز ئاوا نابێ..

**کەربەلا**
**شوباتی/ 1976**



## شەوبا

**(1)**

پێکەنە!
پێکەنینت کەژە خەمەو
چەپەر بە ڕووی خەما ئەکا..
پێکەنینت سێبەری دارتەڕاشێکەو
شوانێکی چۆغە مەرەزی (سەکری سەکران)
بێریەکی تیا ماچ ئەکا..
ـ (تۆ بە تیری کام فریشتە بورایەوە؟
دەم بۆ پێکی کام کچ دەبەی؟!
شەنگەبی لە داخی سێبەر یاخود شەماڵ..
هەڵدەلەرزێ؟)

**(2)**

ببە بە خەم!
تاکو شۆخێ بتچنێت و بتخاتە توورەگەی مازوو
ببە بە بەرخێ بەهاری
تا لە ئامێزی گەرمۆکەی کابانێکدا
لە خەوێکی کەسک و سوورا لاڵ و پاڵ بیت..
ببە بە چەپکێ نهێنی؛
تا نازدارێ
وەک نامەیەکی دڵداری
لە درزی مەمکۆڵەکانی هەڵتگرێت..



**(3)**

شەو ڕاشکاوەو
کیژۆڵەیێ چاو گەلاوێژ چاوەکانی ناچنە خەو..
شەو ڕاشکاوەو
کیژۆڵەیێ ئەستێرەکان، وەک پوولەکە،
یەک یەک دەچنێت..
دەکاتە سەد.. هەزار.. ملیۆن..
شەوبایەک دێ و
نەرمۆکە خەوی لێ دەخات!!





شەوێکی تر
لە یەکەوە.. بۆ دوو.. بۆ سێ..
ئەمجارەیان ئەستێرەکان
یەکە یەکە،
بەسەر باڵی پەریزادا دەڕژێنە خوار..

ـ (تۆپێکەنە!
پێکەنینت گریانی تیا هەڵدەواسرێ..
بزەی تێدا دەکرێ بە بووک..
تۆ..
پێ..
کەنە!)

**بەغدا**
**1975/12/15**

## شەونمی پرسیار

بووم بە گزرەی گوڵدانێ سەوز
تا شەپۆلەکان چۆکیان داو
شەو ڕاشکا..
بەدەسکە پێمەڕەیەکیماندوو و شەکەت،
قاییێخی لەدایک بوونێکی ترم تاودا..

ـ (تاودان: گوڕە!
گوڕ: ڕەهێڵەی ماندووبوونە!!
ڕەهێڵە: ڕوومەتی خونچەی،
گەرد لێ نیشتوو.. دەشواتەوە..)



چۆکدادانی شەپۆلەکان
وەڵامێکە.. بێ پرسیارە!
پرسیارێکە.. بێ وەڵامە!!

ئەی تۆ گیانە؟
تۆ ڕەگۆکەی سەرنجە سەوزەکانی خۆت،
لە کام کەنار دادەکوتی؟
تۆ لە کامە پرسە دەگری و
لە کام ئاهەنگ پێدەکەنی
ئەی دڵدارە زیزەکەی من؟!

**کەربەلا**
**1976/8/6**

## قردێلەیەک.. کرایەوە

بۆ پرچی ئاڵۆزاوی تۆ، بووم بە شانە..
بووم بەکل، بۆ برژانگی چاوەکانت..
بەخوێنی خۆم،
گۆنای زەردهەڵگەڕاوی تۆم سوور کردەوە..
نەم هێشت هەتاو بتئەنگێوێ،
هەردوو باڵم، بۆ کردیتە
کەپر و ساباتێکی نسار..
بووم بە پەلکەی گیتارەکەت..
بەڵام ئەتۆ:
کچێ توخوا چۆن دڵت هات؟
لەبەر سێبەری باڵی من
نەواو ئاواز
بۆ لاوێکی لایدە لێ دەی؟!

ڕشت–ئێران
1975/8/14



## 2 پۆستەر

**(1)**

ئێمە هەرگیز دەسبەرداری نیشتمانەکەمان نابین..
وەک چۆن خۆر
دەسبەرداری ئاسمان نابێت..
وەکو ڕووبارو سەرچاوە..
کە دەسبەرداری یەک نابن
ئێمە هەرگیز دەسبەرداری نیشتمانەکەمان نابین..

ئێوە ئەی ڕەگەزپەرستان
چۆکدەن ئیدی..
لە نیشتمانمانا دەرچن!
جێ بهێڵن
وڵاتەکەمان جێ بهێڵن..
ئێمە هەرگیز دەسبەرداری نیشتمانەکەمان نابین..
بەخوێن.. بەخەبات..
بە سروودی کۆڵنەدان.. هەر دێینەوە.

**نەجەف**
**1976/8/5**



**(2)**
**«تل الزعتر»**

گیانە تۆیان کوشت!
لە کاتێکدا وەک فرمێسک
ڕوون و پاک بووی..
تۆیان کوشت، گیانەکەم!
بەڵام هەموو پەڕەندە باڵکراوەکانی
سەر ڕیشاڵەکانی دڵم..
وەکو نرکەی سەرەمەرگی تۆ دەخوێنن..

دەخوێن و ماندوو نابن..
تۆیان کوشت، ئازیزەکەم!
بە (قەناصە)یێ تۆیان کوشت
بەڵام دڵنیابە ڕۆژێ دادێ
لە چاڵە بەتۆپ کێڵراوەکانی (تەل زەعتەر)دا
چەپکە ڕووناکییێ بچنم..
ئەوساکە لە باتی گوڵ
وەک نوورێکی خوداوەندی،
لەسەر مەزارەکەتی دادەنێم و
وەک چوکلێتیش،
بەسەر مناڵە چاوگەشەکانی (تەل زەعتەر)
دەیبەشمەوە..

**عەبباسیە-کوفە**
**1976/9/16**





# یادو خۆشەویستی

**(1)**

خۆشەویستم کە منالّ بووم
وەک پەپوولە لە باخی ژین
دەمی گولاّنم ماچ ئەکرد..
ئێستاش گیانە کە گەورە بووم
وێلّم بەدوای، باوەشێکی گەرم وێلّم!!
وێلّم تەنیا بۆ قومێ ئاو
وەکو جاران،
گەروی وشکم تەڕ کاتەوە..



**(2)**

خۆشەویستم!
دەزانی بۆ لێوەکانی تۆم خۆش ئەوێ؟
من دەمەوێ  لە ناو بزەی لێوەکانتا
هیوای دوارۆژی هەزاران
ڕەش وڕووتی ولاّتەکەم بەدی بکەم..
دەزانی بۆ چاوەکانی تۆم خۆش ئەوێ؟
من بەتەمام!
پاپۆڕەکانی ئازوقە
بەناو دەریای چاوەکانت
بۆ شاری برسیەکان ببەم..

**(3)**

خۆشەویستم!
من دەمەوێ:
لە دوای نۆ ساڵ ئێشک گرتن..
بۆ ئاسۆیەکی ڕووناکتر
بەرابەر تیشکی ئازادی..
پێبکەنم..
بەستە بڵێم
بۆ هەزار لێو.. بۆ هەزار چاو..



دەمەوێ کە سواڵکەرەکان،
ئەمجارە لە جیاتی نزا
گۆرانی بۆ ئاوات بڵێن..

**هەولێر**
**کانوونی دووەمی/ 1973**

# چاوەڕوانم بە!

**(پێشکەشە بەو شۆخە کۆچەرەی**
**ڕۆژێ لە ڕۆژان بەچاو یەکترمان ماچ کردو**
**هەر بە چاویش بڕیارمان دا جارێکی دی**
**یەکتری ببینینەوە!)**

* وەکو هەموو ئێوارەیێ
کە دەسمەنجەڵی مەرِدۆشین
بە باسکە تاوبردووەکانت وەدەکەی و
چاوەڕوانی گەڕانەوەی مێگەل دەکەی..
وەکو ئەوەی،
چاوەڕوانی دەرکەوتنی نێرگس دەکەی
ئاواش چاوەڕوانی من بە!

* هۆ کیژۆڵە خوێن گەرمەکە!
ئازیز! کێڵگە،
چۆن چاوەڕوانی بارانە..
پەپوولە چۆن چاوەڕوانی وەرزی دەرکەوتنی گوڵانە..
ئەتۆش ئاوا..
کە چاوی چاوەڕوانیشت،
ماندوو دەبێت..
بڕۆ لە ژێر دەوارێکا.. ڕابکشێ..
بیرکەرەوە!!
ئێمە هێشتا لە یەک دوورین..
هێشتاکە پێک نەگەیشتووین!

**ڕشت–ئێران**
**1975/9/26**

# ئەی بەفرەکە!

کە ئاسمان دەتپروشێنێ،
مینای پەنجەرەی کۆڵێتی کوێستانان
دادەپۆشی و
لەگەڵ خۆتدا خەو دەهێنی!!

کە وەک گەڵاکانی درەخت
بە هێمنی دەڕژێییتە خوار
لوتکەکانم لێ ون دەکەی!!



کە وەک تەزرەش،
بەخوڕ بەسەر چیاکاندا گوزەر دەکەی
بەرزاییەکان لە بەفری کۆنەساڵانا دەشۆیتەوەو
هەزاران باڵندەی کێوی
لە خەودا وەخەبەر دێنی..

ده ئەی بەفرەکە!
سنگ بدە سنگی زریانێ و
بەهێمنی مەڕژێرە خوار
ئەی بەفرەکە!

**نەجەف**
**1976/9/21**





## ڕێژنە

کلدان بێ کل، کلدان نییە..
گڵکۆی بێ تەرم.. گڵکۆ نییە..
ڕێژنەی باران،
قژی لوتکە دانەهێنێ.. ڕێژنە نییە..
شیرینەکەم!
تۆش بێ بەهار
تەوژمی گڕی نەورۆزێ
لە دڵم دادەگیرسێنی..

**هەولێر**
**شوباتی/ 1974**



## سەکۆ.. دڵەکەم

گیانە ئێستاش کە لە هەواری غەریبی و دۆزەخی یاد
چاولێک دەنێم!
بزەی گەرمی لێوی شەنگت
وەک کەروێشکەی، شکارتە دەغڵەکانی بەهار
تاوێ دەمبا بەرەو نسێ و قەدپاڵەکان..
تاوێ لەبەر،
تیشکە گەرمۆکەی بەهارا
دەمبات و دەمهێنێتەوە!!
ئێستاش گیانە
تاڤگەی خۆشەویستی تۆیە
گەردی غوربەت
لە چاومدا دەسڕێتەوە!!

گیانە زۆرجار کیژۆڵەکانی ئەم شارە
خەندەی پێکراوی لێوانم تیمار ئەکەن..
زۆرجار لە کرێوە و بەفردا
پەنجەی سڕبووم دەخەنە ژێر سوخمەکانیان..
بەڵام هیچیان،
جێگای تۆم بۆ ناگرنەوە!!
بەلایلایەی هیچ کامێکیان خەوم نایێ.
هیچ پرشنگێ،
وەک شەفەقی چاوەکانت
سەهۆڵبەندانی دەروونم.. ناتوێننەوە
گیانە هیچیان..
هیچیان، هیچیان نابن بەتۆ
تۆی کە تۆزی غەریبیم لێ بتەکێنی..
دووچاوی تۆن:
لە شەوە ساردوسڕەکانی بێ ئاگردا
دەبن بە کڵۆ پەنگر و
لە هەناوما گەش دەسووتێن..
گیانە
هەر
تۆی....

**زێوە/ مەرگەوەڕ**
**1975/3/28**





# گارنیکا

«بۆ خەباتکارانی چیلی»

(1)

تۆ پێم نالێی،
چۆن دەگری و پێدەکەنی؟
پێم نالێی چۆن کۆرپەکانت دەلاوێنی؟
تۆ پێم نالێی، ئازیزەکەم
کە بروسکەکان وەکو تەزرە،
دەپرژانە سەر قژەکەت
چۆن خێوەتی بێدەنگیت بەخۆت دائەداو
لەگەڵ کورژنی ئەسپەکان،
بەرەو ئاسمان هەڵدەفڕی؟
تۆ بەڵەکت لە کامە قەدیفە دەگرت
کە لافاو گوێزینگەکانتی، تەڕ نەدەکرد؟!



(2)

وەرە خوارێ!
لە لاملەی کێوی نووستوو.. وەرە خوارێ!
وەرە خوارێ!
سێبەری هەوارەکەمان هەڵبەستێکە
لە تۆش زیاتر لە کۆڵ ئەنێ..
وەرە خوارێ!

ـ «نسێی ماڵمان
هۆنراوە بوو..
(فیکتۆر گارا) ویستی بیکاتە گۆرانی..
لەپڕ کەنار بوو بە ڕووبار..
بەفر سوور بوو پڕیشکەی ئاگری داباران!!
(گارا) تۆراو،
دەستی وشەی شیعری منیش
لە گەردنی یەکتر پچڕان!!!»



بیکاسۆ! لە کوێی؟
بەژێی خەمە سوورەکانم
هۆنراوەیەکی بێ وشە بهۆنیەوە؟

نیرۆدا! لە کوێی؟
باڵی زیندووی (سانتیاگۆ) بکەیتە بەر
بارەکەوێکی بێ باڵی ئەم شاخانە..

**(3)**

شەپۆلەکان،
وەکو ڕەوە کۆترێ بوون
نامەی هەموو دڵدارەکانیان دەگەیاند..
شەپۆلەکان:
لە هاوینا تاڤگەیێ بوون
زستانانیش،
ئاورینگیان بەسەر خاکی سڕ دەباران..
ئازیزەکەم!
شەپۆلەکان
هاواری خاپوری سەدان
(دێر یاسین)و (گارنیکا)یان
لەبەر سێبەری مێژوودا هەڵدەواسی!!
شەپۆلەکان،
دەنگ بوون.. ڕەنگ بوون







کوا دەنگ؟
کوا ڕەنگ؟
ک..و..ا؟
ـ گیانەکەم دەنگ؟
دەنگ بوراقە..
کوا پەیامبەر؟!
ڕەنگ فرمێسکە و تک تک بەسەر،
سیمای ماندووی (نیرۆدا)دا دێتە خوارێ..
ڕەنگ بارانە..
کوا ئەو کێڵگەی پاچ دەپسێنی و
لە گاسنەکان یاخی دەبێت؟!



## (4)

**ـ «من گریانم بە ڕوومەتی منالآن لە جریوەی باڵندەکاندا نەدیوە!»**

منالّەکان ئەمجارە خۆیان گریانن
باڵندەکان چۆن ئەتوانن
بۆ چەقۆ گۆرانی بلّێن؟!

گیانە باڵدار چۆن ئەتوانێ؟
بۆ چەقۆ گۆرانی بڵێ؟
گیا..نە.. با..ڵ..دا..ر،
چۆن ئەتوانێ؟!

**(5)**

براکانم (هانۆی) لە دوکەڵا سووتا
بۆیە ئێستاکە وا سەوزە
براکانم..!!

**نەجەف**
**1976/6/7**



# ئەی ئاوایە خەمبارەکەم!

ئەی ئاواییە خەمبارەکەم!
من غەریب نیم؟
یاتۆ نەفرەت لە غەریب دەکەی؟!!
من ئاشق نیم؟
یا تۆ ئاشق لە باوەشی خۆت ناگری؟
من چۆلەکەی باڵکراو نیم؟
یا هێللانەی ژێر سواندەی مزگەوتەکەت
پەڕەندەی بێ باڵ داڵدە نادا؟
ئەی ئاواییە خەمبارەکەم؟!

**نەجەف**
**1976/9/29**

# ئەو شەوانەی خەوم نایێ

بۆ ئەو شنە سیحراویەی، خەو لە چاوم ئەتۆرێنێ..

بەرە بەیانە..
ئەوا شەپۆلی ڕووناکی
پۆل، پۆل لە دەمی ئاسۆوە دێنە دەرێ و
هێمن، هێمن
پەردەی سپی،
بەسەر شانۆی شەودا ئەدەن!!
گیانە منیش دەگەڵ مانگ و ئەستێرەکان
ئێشک دەگرم..



بەرەبەیانە و ئەوەندەی دەکەم،
چاوەکانم،
وەنەوز نایانباتەوە..
بەرەبەیانەو
دڵ تامەزرۆی کلّپەی ئاگری ماچێکە!

خاتوو ئەستی!
گیانە دە، کەی؟
«خاتون بسکان تاتا، بکە؟
گیانە گۆنات بنەخشێنە..
کلیلی سنگ و مەمەکانت بترازێنەو
شەوق لە ڕۆژدا بستێنە..»
ئازیز دە، کەی؟
من نانووم و ماچت دەکەم..
من نانووم و
کام گۆرانی
چۆلەکەی دڵت دەفڕێنێ
دەبم بە نۆتەی ئاوازی..
من نانووم و
لە سروەی بەیانیەکتا ئاوزنگ ئەدەم..
من نانووم و
لە ماچێکی ئەفسوناویت ئەتوێمەوە..

**سەلاحییە-نەجەف**
**1976/5/19-7**



## ئەو ئەستێرەی لە دڵمدا ئاوا نابێ..

ئەستێرەکان جوانن و ئەدرەوشێنەوە..
چاوەکانم
دەسلەملانەی هەموویانن..
بەڵام ئەوەی بەدڵ.. بەگیان
تاسەی دەکەم..
ئەوەی کەوا بە ڕۆژ و شەو
لە دڵمدا ئاوا نابێ و
لە ئاسۆی چاومدا ونە!!

ئەستێرەیەکە وەک گەوهەر
ورشە ئەدا..
ئەستێرەیەکەو گەلێ جار لێم زیز دەبێ و
وەکو منالّ، دوای گریان..
خامۆش، خامۆش دەچێتە خەو...
هیچ ئاسمانێ نایگرێتە خۆی!!

**کەربەلا**
**1976/3/27**



## چاوەکانت

هێشتاکە ڕۆژ.. هەڵنەهاتووە
کە چاوە خومارەکانت
وەکو دوو خۆر
لەکەلی دلّمدا هەڵدێن..

هێشتاکە شەو دانەهاتووە و
تاڵ تاڵی تیشکەکانی خۆر
بۆ دەمی قۆزاخەی ئاسۆ نەکشاونەوە..
کە گلۆپی چاوەکانت
دەبن بەمانگ.. بە ئەستێرە..
نەء بەدوو خۆری شەوانە و
لە بیابانی شەوەزەنگی،
غەریبی و تەنیایی دڵم.. هەڵدێن...



گیانە سەکۆ!
کەی چاوەکانت دەچنە خەو؟!
کەی، کەی دەنووی؟!!
دڵەکەم نانووێ
تۆ کەی دەنووی؟
تۆ
کەی
دەنووی.. ئازیزەکەم!

**ڕشت**
**1975/8/16**

## بۆ کچێکی دڵ ناسک

تۆ دەڵێی،
تیشکی سۆزم بەسەردا ببارێنەو
کەس نەزانێ!!
دەڵێی دووکەڵی جگەرەکەت،
بەکزەبایەک
بەرەو ڕووی من دا بنێرەو
کەس نەزانێ!!



هۆکارە خنجیلانەکە!
ئەتۆ لەپکەشینەی منت لە گەردنەو
حەزیش ناکەی کەس پێت بڵێ،
بەژن زراڤ
پەنجەی کام لاو
ئەم گەردانەی بۆ چنیوی!
گیانەکەم تۆ، بۆچی ئەوەندە شەرمنی؟

ئەی من چی بکەم؟!
خۆشەویستی زیخی قەراخ ڕووبار نییە
شەپۆلی لافاوی بەهار دایبپۆشێ!
کێ نازانێ (فەرهاد) (شیرین)ی خۆش دەویست؟
کێ نازانێ
(مەم) (زین)ی لە گلێنەی خۆی هەڵدەگرت؟
کێ نازانێ؟!







با لاوکی چاوەکانت،
داوی سەرنج بەرهەڵنەدا!!
تا هەست بەجۆللانەی چاوی
دایکت بکەم..
دەبا مانگ و ئەستێرەکان
بریسکەو هوڕی قژی خاوت،
تاڵ تاڵ قوت دەن..
تا سەوز و سوور..
نێرگس و گوڵە بەیبوونە
لە یەکتری جیاکەمەوە!!
کێ نازانی کە بۆم دەمری و لە بۆت دەمرم؟
کێ، گیانەکەم؟

**ڕشت**
**1975/8/14**



## ئەو وشانەی
## لەئامێزی خۆشەویستین

وشەکانم چرۆیەکی نەپشکوتوون
بەگژ دیواری قۆزاخەی
خۆیان دەچن..
گەواڵە هەورێکی خەستن..
لە ساڵێکی بێ باراندا
تینوویەتی هەموو کێڵگەیەک دەخۆنەوە..
وشەکانم
حەز لە قەڵبەزەی ئاو دەکەن
گلێرەی تەزرە ناگرنە خۆ..
کۆتری ئاشتییان خۆش دەوێ
دڵداری تروسکەی خۆرن..
ئاشقێکن
دۆستی گوڵەگەنمەکانن..
وشەکانم
گریانێکن لە گەروی مناڵەکانا
وێڵن بۆ قاقای پێکەنین!

**گەلاڵە**
**ئابی/1973**

# سەگێ دەنوێ
# سەگێ خەو دەبینێ..

**(سەرقافڵە گەڕانەوەی بەلادا،**
**ئاوخواردنەوە بوو!!**
**مەولەوییش پێی لە دڵی**
**خۆی نەناو کاروانی ئیزن نەدا!)**

**(1)**

سپیلکەی چاوم
بوون بەدوو پەڵە هەوری شین..
فرمێسکەکانیشم بەدوای،
زەردەخەنەی،
نوقمی قاقای پێکەنینێ،



بوون بە پشکۆ!!
(زەردەخەنە
لە پرسەی تازە بووکێکی،
جوانەمەرگیش
خەم ڕەوێنی بوو بۆ زاوا..
کەچی ئەوەتا
لە قاقای پێکەنینێکدا

دەتوێتەوە!!)
کڵۆ پشکۆ، پێیان گرت!!
کڵۆ پشکۆ لەڕنییەکان قیت بوونەوە..
بەڵام ئەوەتا پشکۆ و پەنگر لە ماچێکدا ئەتوێنەوە!!
ئە
تو
ێ
نە
وە!!
بەڵام گیانە
پشکۆ تەنیا زارو لێوان دەسووتێنێ..



گیانە ماچ دڵ دەهەژێنێ..

(2)

سەکۆ دەنوێ
سەکۆ خەو دەبینێ..
سەکۆ کە لە خەو ڕادەبێ
چوار تامیسکەی،
پەڕیوەتە لێوەکانی!!
کوڵمی یەک پارچە زەنگیانەی قرمزیە!!

سەکۆ جوانە..
وەکو هەموو شتێ جوان..
سەکۆ جوانە..
سەکۆ مێرگی ناو دڵانە..
خانووکەڵەی منالّە ئاوارەکانە..
سەکۆ جوانە..!

دڵەکەم ئەوە بۆ؟!!
تۆ کەی فێر بووی ماچانم لێ بدزیەوە؟
تۆ کەی فێربووی؟

ڕشت



## بگەڕێوە!

1975/7/15

تۆ هەمیشە پاڵەوانی،
چیرۆکی خەوەکانم بووی..
لە ناو باخی دڵداریدا
گوڵێک بووی دیار..
زەردەخەنەی لێوەکانت،
خۆشەویستی
بە پانتایی ئاسمانی شین..





به ئەستێرەکان دەبەخشی..
بگەڕێوە!
جێم مەهێڵە!
بەهۆی خەوشی داستانی پڕ لە ئەفسانە..
گەروی دڵداری هەقیقەت مەخنکێنە!

بگەڕێوە!!
خۆشەویستم!
سەر هەڵبڕە!
ڕووبارەکان..
بەڵاڵوک و دارتاوسەکانی سەرەڕێ..
سەرچاوە سازگارەکانیش..
دەگەڵ مندان..
گیانە ڕووبار، بە خوڕە و هاژەی..
بەڵاڵوک و تاوسەکانی سەرەڕێ،
بە (پۆشین)ی بەرگی خەزان..
هەموویان لەگەڵ مندان...
بگەڕێوە!
جێم مەهێڵە!
بەهۆی خەوشی، داستانی پڕ لە ئەفسانە
گەروی دڵداری هەقیقەت مەخنکێنە!
بگەڕێوە!

**گەلاڵە**



# لێت نابمەوە

**شوباتی** 1973

لێت نابمەوە..
چەندە دووربم..
چەندە سۆزی نازەکانم..
لە تەنیایی و لە غەریبیدا بمرێنن،
سۆزگ وەکو،
تینووی وێڵی بیابانێ
کە لە گوڵ و لە گوڵاو و
بۆنی گەردنی کچی جوان..
تەنها بۆنی، دڵۆپەی بارانی لە بیرە..
گیانە منیش
هەر سەیری چاوی تۆ دەکەم..

من هەر بۆ لای تۆ دێمەوە..
دەزانی چۆن خۆشم ویستی؟
تۆ دەزانی کەی بوو خوێنمان،
تێکەڵاوی یەکتری بوو و
لە خۆشەویستیدا سووتاین؟
گیانە بوولبوول لەکەیەوە چڵ دەناسێ؟
شاخ و بەفر..
خاک و باران..



لە کەیەوە یەک دەناسن؟
من هەر بۆ لای تۆ دێمەوە..
تۆ پاوان نیت..
کێ ئەتوانێ سێبەر لە لەش پاوان بکا؟
کێ
ئە
توا

نێ؟
بم بە سپێدە،
لە باوەشی سامالّی تۆ ئارام دەگرم..
بم بە سێبەر
خۆم بە بنارەکانی تۆدا هەڵدەواسم..
گەر جریوەی ئەستێرەکانیش کپ بکەن
گلێنەی چاوم وەکو فەنەر..
بە ئاسماندا پەرش دەکەم

لێت نابمەوە..
من هەر بۆ لای تۆ دێمەوە..
کێیە دەڵێ گلۆپەکان
لە برینەکانم گەشترن؟!
لێت نابمەوە..
کێ ئەتوانێ سێبەر لە لەش بکاتەوە؟

بەغدا
1976/12/24




**تاڤگەی مەند**

**کۆشیعری دووەم – 1987**

**چاپخانەی شەفیق–بەغدا**



ـ (من لەو دیوی شتە سادەکان دام
خۆم دەشارمەوە بمدۆزیەوە..
ئەگەر منیش نەدۆزیەوە شتەکان دەدۆزیەوە...)

ـ (... ئێمە لە گۆرانی چڕیندا بەردەوام دەبین.
دنیا جوانە
دووپاتی دەکەینەوە:
جوانە، جوانە، جوانە
لە گۆرانی چڕیندا بەردەوام دەبین)

**یانیس ڕیتسوس**

# بێپەروایی

دەنوویەوە؟
لە ئاژاوە و سەرگەردانی ئاسۆی لێڵ بوو و،
ڕۆژگاری تووش و بابردووی
تەمەنی تارماییبەند و شکۆفەڕێژت..
کەی لە شەوی پڕ ئەستێرە و هێمنی وا هەڵدەنگوی؟

دەنوویەوە؟
سبەی کە ڕۆژ دەبێتەوە
ئەم تەنیاییەت
لە کوێ دەست دەکەوێتەوە؟

(تۆ و ئەستێرە و دنیای کپ بوو
تۆ و گڵۆپە چاوزیتەکانی سەر شەقام
تۆ و هەوای خواو
بۆنی گوڵەکانی بەهەشت..
تۆ و خۆت و
تونێڵە گوشادەکانی
خوێنی گڕگرتووی بێ پەروات..
تۆ و غوربەتی دوا نەهاتوو..
تۆ و تۆ و.. و.
........
........
.........)

بەڕۆژ لە کوێ؟
لە ئاسمانی بەرتەنگ و
زەوی هەوەسبازی سوڵتان..
یا ڤڕەڤڕی فڕەی داڵە زیوکفتەکان
سمکوڵ و
سەرەسم و
تیلاکی خوار و سمێڵی بریقەدار
چی دەبینی و
چی دەبیەی؟!
سبەی کە ڕۆژ دەبێتەوە
ئەم تەنیاییەت
لە کوێ دەست دەکەوێتەوە؟



دەنوویەوە؟
(نووستن
مردن)
لێ ڕامینە!
بەینیان تاڵە موویێکە
لە شەوی ئەم ڕۆژگارەدا
هەموو شتێک وەکو یەکە
مرۆڤ لە چۆلەکە دەکا
چۆلەکەیش وەک مرۆڤ وایە،
تنۆکێکی نەڕژاوە
لە چاوی ئەوانەی تەنیا بە دڵ دەگرین.

لێ ڕامینه!
له خۆشبەختی شەوە یا
بەدبەختی ڕۆژ
گزنگی خۆر بەسەر تاوانەکانی شەو دادەڕژێ؟

**دەنگ:** (کلیلی ژیانت بە خۆتە پێ نازانی
پێ نازانی
پێ
نا
زا
نی..!





لە قسان ئاڵی زەنگانی
لە کارانیش....)
ـ: کار دەترازێ
دەترازێ..
دە
ترا
زێ....



تێر نەبووی..!؟
دەنوویەوە..
سبەی کە ڕۆژ دەبێتەوە
جارێکی دی
دەبێ لە خۆت جیاببیەوە..
پشت لە دەرگای کراوە بکەی
ڕوو لە ڕێگایێ بێ ئاسۆ و دنیای گومان..

**دەنگ:** (کێن ئەوانەی شەو بەهیوای سبەینێ
بەڕێ دەکەن؟
کێن ئەوانەی ڕۆژ بە ئومێدی شەوی وا
دەگوزەرێنن؟
ئاپۆرەی شاری خامۆشان
لە کوێرا گوریسی کورتی خەونەکانتان
دەپچڕێنن؟)

تەنیا ون نەبوون بەس نییە،
تۆ بە تەمای هەلێکی
کە نە ڕەنگ و
نە دەنگ و
نە ناونیشانی دەزانی!
هەلێ، کە دێت و نایێ..
تەنیا ون نەبوون بەس نییە.

**1984/9**



# پشکۆ باران

(..........)
ـ لە گەرمەی ملیۆنەها کارەساتی
کلّپەدار و دلّتەزێنا..
لە نێو شەپۆلی هەزاران
ئاوازی تالّ و شیرینا..
لە ئاسمانێ بێ ئەستێرە،
دەنگێ.. چەپکە سۆزێ.. فەنەرێ..
نە ،، خۆرێکی بریندار
تیشک ئەبارێنێ..

ـ تەنگ پێ هەڵچنین و تەنگ پێ هەڵچنین.
بەتیر بەدوای سێبەر کەوتن.
ڕاونان..
خەفەکردنی چرای هەناسە..
ئەسید پێداڕژاندن..
«کاشکی هوشیار نەبوومایە
ئای کە هوشیاری خەمێ گەورەیە!»



بەڵام نەء!
ئەوەتانێ تۆ گڕ لە دڵان بەردەدەی
خۆیشت بێ گڕ،
لە نێو جەرگەی مەسەلەکاندا دەسووتێی.
ئارام.. ئارام
هەرگیز خۆزگە بۆ کەنارەکان مەخوازە
ئای کە ژیان لە کەناردا وەڕس بوونە.

به سەرنجە سەوزەکانی هەڵدەگەڕێن،
دوا تنۆکی هەڵدەمژن...
ـ (بەنگ کێشە!)



ئەوان لەم زمانە ناگەن.
ئەوان لە زمانی باران و تاقگە ناگەن
تۆ بۆنی خاک مەستی کردووی
چراخانیت..
لە دڵی هەموو ژوورێک دای
خۆت بە بنمیچی نرکەی شەو هەڵواسیوە
دەباریتە گۆشەی دڵی کچانەوە..
ستران دەچڕی
دەنگ هەڵدەبڕی:





«بەڵام ئێمە
ئێمە سەوداسەری خۆرین
ناتوانین کە لەودیو دیوار ئارام بگرین.»

ـ پەپوولەکان دەم دەنێنە دەمی ئاگر،
کێ زات دەکا خۆر ماچ بکا؟
ـ تۆ حەز لە تیشکی خۆر دەکەی؟
خۆشت دەوێ؟
ـ بۆی دەمرم.
ـ هەڵدێرە نوتەکەکانی ڕێگات دیوە؟
تا ئێستا بۆت هاتۆتە ژوان؟
ماچیت کردووە؟
تۆ دەتوانی یاری بەقژەکەی بکەی؟
ـ ئەی ناڵێم حەزی لێ دەکەم.. بۆی دەمرم..



«دەستی ماندووم بگرە
دیوارەکان بڕوخێنین،
ئەو ڕۆژە دێ،
هەر ڕۆژێ بێ
دوور و نزیک..
پێکەوە،
دەگەینە ڕووبارە مەزنەکەو
تینوویەتی لەش و گیانمان دەشکێنین.»
دەستی شەکەتم بگرە.!
ڕۆژێ دێ ئێمەش پێبکەنین...

ـ ئەو ڕووبارە لایلایەی
خەوی خۆشی منالآنە..
لە گوێمان دەزرنگێتەوە
بەرگی سپیدەی نەورۆزە
پرچی دەسگیرانەکەتی تیا بۆن دەکەی.
ئەو ڕووبارە جیهانێکە؛
مرۆڤە لەبیرکراوەکان
لە خاکی لەبیرکراویان سەوز ئەبنەوە.
بەهار دادێ
لە نێو جەرگەی شەوەزەنگەوە خۆر هەڵدێ..
تاریکایی ڕۆ دەچێ
ئاسمانی شین دەبێتە پەلکەڕەنگینە..



ـ بۆ کوێ بچن؟
«باڵدارەکان بۆ کوێ بچن؟
هەوای قەفەس کوشندەیەو
دەرەوەش پڕی دڕندەیە..
باڵدارەکان بۆ کوێ بچن؟»

ـ ئەوە تۆی ڕووت لە تاریکی کردووە؟
ـ پشتی تێ کەم؟
ـ ئەی تۆ ناڵێی ژیان لە کەنار وەڕس بوونە..

1977/11



# تواندنەوە

«بۆ خاتری خەندێکی بەڕەنگی گوڵ و باران
عاشق ئەوەتا هەر کوڵی گریانی لە دەمدا.
وەفایی»

(1)

ئێوارەیێ قرمزی بوو
لە هەیوانە خماوییەکە
تۆم دی بە (مەرگ) پێدەکەنی
گاڵتەت پێ دەکرد..
ئێوارەیێ قرمزی بوو.
تۆم دی:
عاشقێ بووی، کۆچت ئەکرد
لە کاتی (ماڵئاوایی)دا،
زیاتر دەسووتای
زیاتر سۆزت ئەکرد..

تۆ دەزانی (عەشق) هەرگیز دوایی نایێ
بۆیە ئاوا پڕشنگی خۆر دەکەیتە (ڕێ)و
بەرەو (لوتکە) ملت ناوە..
دەزانی هەزاران خونچە
سەریان ناوەتە باوەشی خەمەکانت
بۆیە بەرگی نیوەڕۆییێکی هاوینت
لەبەر (سرە)ی شەوێکی زستان کردووە.



دەماڵئاوا!
خۆشە مردن
«خۆشە بە عاشقی مردن».

**(2)**

ئێوارەیێ قرمزی بوو
تۆ (بەرد) بووی، سۆزیشت ئەکرد!!
دەسووتای.. سۆزت ئەکرد.. دەسووتای..
تا دەبوویەوە خوێن و گۆشت..
ئەمجارەشیان ماڵئاوا!
ئای چەند خۆشە
(مرۆڤ) بە عەشق بسووتێ.



**(3)**

بەفر ئەتوێتەوە، (بەهار) دێنێ.
تۆیش سۆز ئەکەی...
ئەوە نییە بەرگ...ی نیوەڕۆی هاوینت
لەبەر سڕەی شەوانی زستان کردووە؟
ئەوە نییە دەسووتێی و بەهار دێنی
نەورۆز دێنی؟

**1979/2**

## هەیوە شەوێ

شەوگارێ بوو
تۆ چراخان بووی و شکابووی
هەیوە شەو بوو
تازە خونچە بووی دەپشکوایت
ورشەت دەدا.. دەت جریواند
ئەستێرەی گەش و جوانت
لە بەرزایی ئاسمانەوە
بۆ باوەشی خۆت دەڕژان.
منیش ببووم بە شنەی بایێ
سواری باڵی خۆمم کردی
هەموو گۆشە و قوژبنێکی
ڕێگای بەتۆ گەیشتنم پێ ڕوون کردی.



(خۆم لە غەریبیا دەبینم،
شوانێکم ئاوارەمە
بە شمشاڵەکەم شەیدایی و
غوربەتی چاوی جوانی تۆ
بۆ چیای چۆڵ و
بنەدارە بڕاوەکان باس دەکەم.
هەر من نیمە بە تیشەی گڕ
بەربوومەتە ئەم تاریکییە
سەد (فەرهاد)و (مەم)ی تریش بەڕێوەنە
داستانی تر دەنووسنەوە.)

پێت گەیشتم
ماچم کردی.. بۆنم کردی
کارەساتی ماندوویێتی و برسییەتی
ڕێگام بۆ دەگێڕایەوە..
تۆ دەگریای
زەنگۆڵ زەنگۆڵ فرمێسکت هەڵدەباران
فرمێسکی تۆ
دەبووە ئاونگی سەرپەڕەی
گوڵی ژیانی دڵداران..

ئای گیانەکەم لە شەوێکی مانگەشەوا
ژوانی عاشق چەند دژوارە
خەونی شاعیر چ دنیایەکی ساکارە.

**1979/11**





## پەلکە گیای نەورۆز

تۆ لەبەر پێی عیشقی خۆتا
کڕنۆش ئەبەی
بە پشەبایێ شەپۆل ئەدەی
تۆ نێرگزی زۆزانی
لە زەردەخەنەی منالێ ساکارتری.
هەوای عیشقی
لە هەموو دلێ دەخزێی
بەڵام لە خاکی نەورۆزا نەبێ ناڕوێی
ئەی پەلکەگیای عیشق و سووتان..

1978/3



## ئاودەنگی

پێش ئەوەی بێی
دنیا چۆڵە
سپێدە غەریب.
هەمیشە درەنگ دێی.
کە دێی گۆنات پشکۆیێ ئەرخەوانیی
بەهارت کردووە بە تۆقەی؛
تاڤگەی هێمنی پرچت..
لە دەرگا دەدەی،
لە دڵەکەم دەدەی

(ئاگر، ئاگر خەفە دەکا..
ڕووبار دەریا دەخنکێنێ
تۆش من..)

ئەو ئاپۆرەیە بشکێنە
ئەو تاڵە مووە بپسێنە..
من کەی دەتوانم خۆم لەبەر سپێدەیەکی بارانیی وا شۆخ بگرم؟



هەمیشە درەنگ دێی
پێش ئەوەی بێی
دنیا چۆڵە
سپێدە غەریب.
کە پێ دەنێیە هۆڵەکە
پێ لە دڵی منیش دەنێی..
ئاخ.. دڵم.. ئاخ!

به خێرایی لەرینەوەی چڵێ نێرگز تێدەپەڕی
شیعر لاڵە
نمەی باران
ڕوونایی چاو
قوڕگی گیراوی سپێدە دەکاتەوە..
من دەزانم
بە چاوی تۆو
تەزووی گەرمی لەشی خۆمڕا دەزانم
ئەو تاڵە مووەی نێوانمانت
لێ بووە بە کێوێ سەخت
بە غوربەتی هەموو دنیا..





تۆ گەردوونێکت لە چاوت هەڵگرتووە
کچی شەفەق!
خوا..
نیگاکان..
خەوی بەرسێبەری درەخت
بەغدا..
ڕۆژانی ئومێد و خەم..

من ناتوانم ببم بە شتێکی دی.
لەوەتەی هەم
شەو لە ئەسپی سەرکەشی ڕۆژ دەبەستم
چاوم بڕیوەتە ئایندە..
من ناتوانم ببم بە شتێکی دی
تۆ دەتوانی..
تۆ دەتوانی ببی بە ئاودەنگی ڕێگەم
بە تارمایی و شوێنەواری
ڕۆژانی عیشق..
تۆ
دەتوانی
کچی
شەفەق..!



لەگەڵ ئەوەی کە نابێ خۆشم بوێی،
خۆشم دەوێی.
خۆشم دەوێی، کچی شەفەق!

کارەساتە، تاڵەموویەک
بەقەد هەموو غوربەتی دنیا ئەستوور بێ.
کارەساتە.. کچی شەفەق!
کا
رە
ساتە..

**1983/12**

## دەربەند

کێ وەکو من
بە تەلانی خەمی تۆدا هەڵئەزنا
کێ وەکو من لە ساتەکانی دڵتەنگیت
ئاوەسۆی لە چاوان دەڕژا؟

دەبا خەمی تۆش ببێتە
بسکێ تری ئەو تاڤگەیەو
با بە خوڕتر



بەسەر چەمی چاوەکانما بێتە خوارێ..
با ڕەنگ زەردبم و لە گەڵای
نوقمی سپییەڕۆژێکی تەماوی بکەم
بەڵام با هەور خەستتر بێ و
بەسەر دڵمدا بباریێ.
باران بیابانی دڵەکەم
خاکی ڕەقی وڵاتەکەم دەکا بە مێرگ.

هۆگرت بووم، بەخۆم نەبوو.
ئەو بەیانیەی،
لە نێرگز دەچووی، لە ڕیحانت ئەکرد..
نازانم چی بووی،
وەک چەپکە بۆنی ئەستێرەیێ دوور
بەناو سیەکانما پڕژای
من نەمزانی بۆنی ژەهر ئەوەندە خۆشە!



ئەو ئێوارەی،
تاراییێکی وەنەوشەییت پۆشیبوو
خۆت خستە باوەشی دڵم..
نەمزانی ڕۆژێ تەمێکی وەنەوشەیی
بەر ڕوونایی چاوم دەگرێ و کوێر دەبم!
من نەمزانی
چاوی مەندو
باڵای مەندو
لەنجەی مەندیش
وەکو (ئاوی مەند) مۆتەکەن..

کێ وەک من بوو..؟
کێ زاتی کرد قۆڵ بکاتە قۆڵی تاوان،
لە سێبەری نیگایەکتا:
خوڕەی ئاو و
ترپەی باران و
شنەی با
فەرامۆش کا..؟
کێ زاتی کرد.. کێ زات دەکا؟

ئێستاکە تۆ بیر دەکەیتەوە کە (نەژاد)
تەنیایەک بوو
دەریایەک بوو
هەموو جۆگەو ڕووبارەکانی خەمی تۆی
لە باوەشی لاڵی دەگرت؟

من نەمزانی
هۆگرت بووم، بەخۆم نەبوو..

**1978/11**





(........)

**- بۆ ڕەحمان -**

بوویت بە گریانی هەورێک و
وەک شەپۆلی ڕووبارێکی دڵ بریندار، غوربەت ئامێز
خورپەت خستە دڵی من.
ئەم دڵەی من،
ئەگەر لەبەر دەسڕێژیشدا پێکەنیبێ
ئەمڕۆ بە نیگای غەریبیت لەت لەت دەبێ.



بۆ کۆچت کرد؟
دوو خونچە بووین لەبەر نسێی چیلە مێوێ
سەرمان بەیەکەوە نابوو..
ڕەگمان لە عیشقی ئەم خاکە داکوتابوو
دوو خونچە بووین پێکەوە دەگریاین و پێدەکەنین
ئەدی گیانە بۆچی پێکەوەش نەسووتاین؟
بۆ هەر ئەوسا هاواری بێدەنگی منت نەخواردەوە؟
نەتخنکاندم!!؟
خۆ من ملم لە تاڵەمووی بسکەکانت زراوتربوو
بۆ هەر ئەوسا.. بۆ کۆچت کرد..؟

ئەی ئێستاکە لە کوێی گیانە..
خەون بە چییەوە دەبینی؟
دەتوانی کە خۆشت بوێم؟
حەزت لە باوەشی منە؟
ئەی بۆچی خۆت بە پشەبایێ هەڵناواسی؟
گیانە ئاسمان بێ سنوورە بۆ باڵ ناگری؟
دەباڵگرە! دە ئەم ئاسمانە پەی بکە
ئەم دڵەی من ئەگەر لەبەر دەسڕێژیشدا پێکەنیبێ
بە نیگاییێکی غەریبت لەت لەت دەبێ.

1977



# هەڵیسان

* خەمی تۆ زرێبارێکە
لە چاوی لە خەو تۆراوی هەژارانە..
چیای سەختی خۆشەویستی
مێژووی نهێنی و حیکمەتی داگیرسانە..
تۆ لە دڵی هەمیشە خوێن لێ تکاوی
ئەو دنیایەی کە ناویان ناوە هۆنراوە
چیرۆکێکی تەواو نەبووی..
تەواو نابی..
(... ...
... ...)

ئێمە یەکترمان خۆش دەوێ
تۆ ئەوە دەزانی و منیش.
ئەوەندەیش بەسە.
ئەوەندە بەسە،
لە نهێنی تاڵی و شیرینی یەک دەگەین.
لە سەرچاوەی سۆزی یەکتر دەخۆینەوە..
......
......





(باران،
باران
ئای باران..)

باران لە کوێوە دەبارێ؟
گوڵ لە کوێدا چرۆ دەکا؟
خۆشەویستی ئێمە نەبێ
چیا لەسەر چی خۆی ڕادەگرێ
ڕووبار بەسەر چیدا دەڕوا؟
ئەمەیان ئەفسانە نییە.
باران ئەفسانە نییە.
ئەم دنیایەش بە خۆشەویستی ئێمەوە ڕاوەستاوە
ئێمە نەبین
بەسەر یەکدیدا دەتەپێ.

**1984/2**



## ڕێبواری

ڕێبواری
بە پێخواسی، بێ جانتا
بێ ژن.. بێ منداڵ
ئەو باسکانەی داوەتە بەر
بەناو دڵی ملیۆنەهادا دێ و دەچێ و
هەست بە پێخوستی ناکرێ!

ڕێبوارێ
خەمی هەزاران هەزارە
بەڵام غەریبەو نایناسین!
ئای لەم سات و لەم ڕۆژگارە
کە دڵ لە خۆی بێ ئاگایە!



چاوەکانم لە خەمی تۆ
لە خەمی دڵێ کە لە خۆی بێ ئاگایە
ژیلەمۆی بن ئاگردانن..
بەڵام من هەر دەڕوانمە
هەنگاوە گەورەکانی تۆ
گیانەکەم تۆ خەمی منی.
ئەی نابینی بەهەر لایەکدا دەڕۆی
خۆت لە باوەشی شەکەت و
ماندووی مندا دەبینیەوە؟
ئەی نابینی چاوەکانم
لە خەمی بەژن و باڵای تۆ
ڕەنگی ئاسمان و زەویان بیرچۆتەوە؟
جارێکی دی
هەر دەڕوانمە هەنگاوە گەورەکانی تۆ.
چاوم لێتە..
چونکە ئەتۆ دڵی منی، خەمی منی.

**1979/8**

# تاڤگەی مەند

***(نامەکانتم خوێندەوە.. پەیام بوون. بەڵام شتێک لە هیچی ئەم دنیایەی نەدەکرد***
***ناکاو گۆلە فرمێسکی پەنگ خواردووی دیدەمی سمی..***
***لەو ساوە بیناییم کوێر بووە..***
***لەو ساوە نەدەتبینم و نەتێت دەگەم.***
***ئەمە، چڵێکی ئەو تروسکاییەیە کە تا دوێنێ***
***بەرپێی خۆمم پێ دەدی.)***



**(1)**

دونیا شەو بوو
کیژۆڵەیێ گۆنای گوڵی سپێدەبوو.
کیژۆڵەیێ چاوی گەشی
هێشتا ئاشنای تۆز و گەردی غوربەت نەبوو
لە شەوستانەوە دەهات،
دڵی گەورەی
خەمی گەورەی
دابووە کۆڵ و
بۆ شاری چراخان دەچوو..

# مەنەفێست

ساوی شیعر نهێنیە تەلیسماویەکەی پێیە،
لە شیعر ئاسمانگەڕتر و لە ساتەکانی خەم پەرۆشتر..
کە ڕۆژێ لە ڕۆژان، خوێندن ونووسینیان بە کۆڵەگەکانی کەرامەتی مرۆڤ
چوواند، خۆڕایی نەبوو..
سرووشێک بوو بە ئاراستەی هەڵگەڕان بەو ساوە، بە نهێنیەکان..
ئەو ئاهەنگە تەنیایانەی خود لە خودی گێڕاوەتەوە..
زەماوەندی گەشبینییە، بە کەژاوەیەکی خەمبار بەڕێوە دەچێت..
کۆڕمان بە ئەزموونی، هەمیشە لە ئەزموون مایەوەدا گەرمە..

وەرە با ئاوەزێیەکان بتەقێنینەوە..
کێ نالێ ڕوومان تێناکەن و ئەندازەی خەونەکانمان ناگرن و
دەرگای لاپرسەنیمان بۆ ناکەنەوە..
هەموو نهێنیە ئاشکراکان، لەگەڵ کردنەوەی ئەو دەرگایە
(با)یان لێ دەداو دەدرەوشێنەوە..

ئەگەر ویستت نیگایەکت لەساوی شیعر بۆ بێت
دەخوازێ بە (با)بدرەوشێیەوە..

ڕێگای هات و نەهات..
شکانەوەی هزر.. هەڵپەی تێهەڵێنانەوە..
ڕاکردن بەرەو ژیان، بەرەو سەودای لاڤایی و
پیشەسازی حوسن و جەمال..
ئاڵودەبوونی تاسە..



ململانێی نەبڕاوە لەگەڵ زمان..
ئەمانە سەدای زەنگەکە دەدەنەوە،
کە سپێدەدەمان بەوپەڕی ناز و ویقارەوە
شیعر لە خەوی پەمبەیی جیادەکاتەوە..

(پەری)یەک گوڵێکی سپییە بە دامێنی چیاوە..
ئاستانەیەکی دی نەما.. قوڵنگی فەرهادی بۆ بخەینە سەرمل
لەو باسکەوە بۆ ئەو باسک..
ڕێگاکان داخراون.. ڕاڕەو زەنەکە،
زۆر قاسیدی بەڕازەکانیانەوە قووت داوە..
ئەشکی خوێنین
بەسەراپای سرووشتی بەستەزمان دێتە خوارێ..
ئەکگیریە کوورە هەڵایساوەکانی شیعر
ئاسنی ساردیان پێ خوار بکرێتەوە..

2004

# خەونێک لەنیوەڕۆدا

ئەو بەرهەڵە هەبێ و نەبێ چییە ؟
ئاوازی جادووگەرانی تاریکی
بە ئێمە لێ نەدرا...
بەفر؛
لە دەرەوەی بازنەی وەرزەکاندا
چرۆی دەرکردبوو..
ڕووبار
پیریەتی یۆتۆپیای لە کۆڵ نابوو،
بە نەزمی کولانەوەی برینەکانمان
دۆڵاو دۆڵ دەهات...



بەهارێکی پۆشتە بوو...
درەخت گەڵایان هەڵوەراند.
ئەستێرە لە هەوران نقوم بوون.
بەڵام ئاخ... کلیلی عومریان شکاندین
چەخماخەی نەوایان بە زریان سپارد...
بەم جۆرە،
(مەرگ)یش جیاوازی تێکەوت!!

بڕوانە! لێومان بە لێوی بورکانەوە ناوە،
قاسیدی هەتاویش لە قامیشەڵانی سۆزدا
ئاوازی جادووگەرانی تاریکی دەچڕێ...

بەختەوەر بوون ئەوانەی ڕۆیشتن
بەختەوەر بوون ئەوانەی نوێژیان بۆ ئایندەی بەفر دەکرد...
بەختەوەر بوون...
ئەوانەی (با)یان لە چاو کرد و
دڵیان لە باران پڕ کردبوو
بەسەر پردی -نۆ هەشت شەش-دا پەڕینەوە
بەختەوەر بوون..





پرۆفاید کۆمفۆرت، بادەی نەشئەبەخش..
شازادەی کسپەدار،
لەبەر ڕەشماڵی لەعنەتیی شیعردا،
کینەوەر
لە شەقامی گریان
لە جوغرافیای داخراو..
لە دڵی سەر تیشە،
سەمفۆنیای ئاگری
کەنار و کەنار
بنار وبنار
ئاسمان و ئاسمان
هەڵدەفڕاند...
بەدنمەکی،
تەنی لەرزۆکی
بۆ بروسکە ناکاتەوە...
ئیتر بەسەرچوون،
ساتەکانی نمایشی پاکیزەیی بەسەرچوون...

ئەستێرە پۆل پۆل ڕایان کرد
تێیاندا بوو
لە لەزەتی جەستەی شەلاڵدا دەتوانەوە،
تاک تاکیش
بەسەر ڕەخشی ئومێدەوە مابوونەوە
دەرژانە گیرفانە زلەکانی ئایدیۆلۆژیا...

ئەو بەرهەڵە هەبێ ونەبێ چییە؟
ئەبەدییەت...
کوێرایی مێژوو...
تەکنیکی داتەپین...
گۆزەیەکی خەت خەتی سۆمەر و
شەقامی بە ژاوەژاوی
مەیخانەکانی (ئور) دەرچوو...



لێم دیارە...با بڕوات
گەردوونێکی سۆزانی،
لە سوێند و شادی و
خەم و درۆدا هەڵکێشراو...
با بڕوات
مۆمێکی هەڵایساو
بەسەر پەنجەکانییەوە دزە دەکا،
تەلیسمی کازیوەیە...
شەفەقی ڕسکان...

دەنگەکان پچڕپچڕ
باران پچڕپچڕ
زیندانەکانی ناخ دەکوتێ...

ئەی خودای تاک و تەنیا
تەنیا
تەنیا
ئێمە سوختەی ئەو هەڵەتەین
لە خاکی لەعنەتیی شیعر،
نە سیپارەیەکمان پێیە
نە تیشوویەک...



ڕۆژگار
بە تراکسوتێکی بریقەدارەوە
لە باخچە ئەفسانەییەکانی شەودا
دەخولێتەوە...
لەگەڵ ئەوەشدا؛
خەنجەرێک نەپشکوی
چرۆیەک دانەوەشێنرا...
ئەی ڕووباری سەرشێت،
ڕووباری پیریەتی یۆتۆبیا
ئەی ترسی نزیک،
کوێرایی با
لە دوورگەی شەختەڕا
دەتکەم بە کۆلارەیەک...
دوور دوور
بەرز بەرز هەڵتئەدەم
تا لە چاوی هەمووانت ون دەکەم..

**نیسانی 2001**

# پایز بێ و
# پەنجەرەت بەسەر گۆلی
# قورینگان بڕوانێ

وشە لێوی بریندار کردم
جوانیەکی فێلاوی.. گەچلاو..
بۆسەی چرا کزەکانی ڕێگا
لە غەریبیدا، دوور لە لێوان
پیاڵەی پڕی لێ ڕژاندم...



بێدەنگیەک
لەشەڕی ناوخۆی گوڵەکانی کەنار
دەزرنگێتەوە.
شەوقی شاربەدەر..
هەتاوی شەشدەر لێگیراو،
باڵوێزی ڕووبارە یەکگرتووەکانی بەهەشت
لە مەملەکەتی قورینگان

بلّێسەی ئەشکەوتەکانی سرووش
نهێنی کوژانەوەو هەڵبوونیان هێنا..
حکوومەتی عیشقیان دامەزراند..
وەلێ داخ سروودی تەمەن
لەگەڵ تاوە بارانێکدا ڕۆیی..
پەنجەرەی عومر لە دەرەوەی گۆشەکانی سۆز
بەسەر چاوەڕوانی ئەزەلیی نیشتمانەکەمدا دەڕوانێ.
.........................................
.........................................
.........................................



پایز بێ و پەنجەرەت
بەسەر گوڵی قورینگان بڕوانێ
سۆزو سەنگدڵی پێکەوە دەبینی..
دەتوانی شنەی نەرم بپۆشی
گیرفانت لە شەونم پڕ بکەی..
لەگەڵ خەمەکانت کۆببیەوە
باس لە بارودۆخ و پێشهاتە هەنووکەییەکان بکەن.
هەر ئیمێلێکت بوێ
بەگەردنی قورینگانی بنێری..
.........................................
.........................................
.........................................

وەهمێکی چەند خۆشە
مرۆڤی دڵ هەلا هەلا
هەموو جیهان
لە قەرتاڵەیەکدا کۆبکەیەوە..
شیرەی هێدمەبوونە..
بەخششی ژاڵە.
لە کەش و هەوای تاریکستان
لە خۆشەویستیەک دەچێ
هیچ حکومەتێک دانی پێدا نانێ
هیچ فراکسیۆنێکی پەرلەمان پشتگیری لێ ناکا
هەمیشە ون
هەمیشە تەنیا
هەمیشە بێ وێنە.

**تشرینی یەکەم/2002**



# پاسەوانەکانی ناخ

پەیژەیەک لە گوڵ بۆ هەور...
لە هۆمیرۆسەوە
هەمان تارمایی وهەمان وەهم:
سەمای دڕک
لێوارە بە تەنتەنەکانی پرسیار
کەللەپڕیی، کەڕوو...
سەری پەتەکان لە فڕین دەچن...
ئاسۆ لە پڕۆتۆکۆلێکی قەدکراو
لە تەقسێکی ئابڕووبەر.

(ئەوانەی، ڕۆیشتن
ئاسوودە لە سپێدەی ئاژاوە
ئاسوودە لە چاوەڕوانی...
نهێنییان بۆ ئێمە جێ نەهێشت...
دیماهیان بەسەرابی
بڕست و پەندگۆیی و پیرۆزگری هێنا...
ئەوانەی ڕۆیشتن
لە بێشەلانی (ئا)و (نا)وە،
ئاسوودە لە سپێدەی ئاژاوە
ئاسوودە لە چاوەڕوانی
بۆی دەرچوون...)



گوێی شار بە وتاران بریندار
مردن لە ژیان خۆشتر نەبوو...
مۆرێک بۆگۆشەگیری،
بۆ زمان پژان،
بۆسۆز...
گۆڕ لە خەونێک دەچێ سپی
سپی وەک کەفاوی سابوون
وێنەی (خود)ێکی سەر بەتەم...

چاوی شار بە وتاران سووتاو
هەور بە مشتێ خۆڵ
بەری ئاسمانانی نەگرت...

ئینجانەیەک لە کلیل
شۆڕشێک لەشەرم
شەو نەیهێشت قژم لە سەردا بڕوێ...
شەو نەیهێشت من و خۆم
یەکتری ببڕێنینەوە...
شەو نەیهێشت گوێمان لە فرمێسک
چاومان لە دەنگ بێ...



(تۆنێلێکی تاریک بوو
ئەو گیانبەتاڵییەی لە ئاڵوودەیی زیاتری تێدا نەبوو
مۆتەکەیەکی پیر، کانگەی شەیتانهێن
شەشدەری لێ گرتبووین...
ئەی شاری گۆڕ!
کە دڵنیا و ئاسوودە لە ڕەهایی ئاکامەکانەوە
پێ لەسەر پێ تیلاکت لێ خوار کردووە...
ئەی جەستەی تاجە خلۆر کراوەکان!
پیاڵەو سەنگدڵی و مەیخانەش
بۆ دەرەوەی خەونەکانمان تووڕدران...
ئێستا تارماییەکی ئاوابوو و
ئەستێرەیەکی نووستووین...
ئێستا لەخاڵێک دەچین
تا لەبەر ژمارەیەکمان دانەنێن ناخوێندرێینەوە...)

شارا چ شارا
سروودێکی دەگمەن
کوورەی نوور...
شارا چ شارا، بە خۆی دەچوو...
گەنجینەی کەژاوە
گوڵێکی ڕەنگ هەڵایساوی باخچەی خوا
نیشتمانێک پڕ بە هەناسە...
لە زەماوەندی شەختەدا
چووە دەست ئەوانەی
ڕێگایان بۆ نەدەچووەوە بانە...



شارا چ شارا؟
زەمانێکی زۆر کولێرەی لە ژەهردا کردە قیبلە
کولێرەی کردە دەزگای بیرکردنەوە لە مردن...
شارا چ شارا
جۆگە و ڕووبارەکانی لە چوارچێوە دەگرت...

زستانێک لە پەمۆ
کرمی ڕووناهیخۆری
لە جەستەی دنیا بەرداوە...
کازیوە
سپێدە
نیوەڕۆ وئێوارەیان پێ نەهێشتین...



داد ئەی شاری گۆڕ
کە دڵنیا و ئاسوودە
لە ڕەهایی ئاکامەکانەوە
پێ لە سەر پێ
تیلاکت لێ خوار کردووە...
بەهارێک لە شێتی
شیعری بە قەسیدەمانەوە نەهێشت...
داد...داد...
داد... ئەی شاری گۆڕ
باڵایەک لە کینە
کێوێک لە پۆستاڵ
داڵانێک لە خونکاریی
شایان بوو بدرەوشێنەوە؟





ئەوانەی ڕۆیشتن
ئاسوودە لە سەری پەتەکان
وەک بەرپابوونەوەی پەپوولە
یا گوێ بۆ مۆزارت ڕادێران
لە حەقیقەتی سێبەرە کزەکاندا
دەیانویست بە ماچ
دەمی ئۆپۆزسیۆنی ئەڤین بگرن.

بۆشاییەک لە پری
جبەخانەیەک لە ئاشتی

ڕێگە بوو دەڕۆیی
نەک قاچەکانی من
مانگ بوو دیار بوو
نەک پەنجەی من...
ئەو دارەی سێبەری دەکرد
شین نەبووەوە...
ئەو پاژنانەی شوێنەواریان دەرکەوتبوو
پاژنەی بۆرە جەنگاوەرەکان بوون
دیلیان لە مەزرای ئەجندان
بە پەتی پەشمین دەخنکاند...



ئیتر تەواو ئەی چاوی پاسەوان
چیرۆکی سێبەر لێرەدا تەواوبوو...
گرێکان
لە هێدمەی هەرزەیی و پەیمانشکێنیدا
لێرەدا کرانەوە
لێرەدا...
ئەی چاوی پاسەوان...

**شوباتی/1998**

# ئایندەی پایز

چرایەک لە حوسنی تۆ هەڵبووە
وێنەی ڕێژنەی گریانی جودایی...
وەک خەمی نیشتمانی دوور...

سێبەری کز...مۆسیقای ناخ
بێداری هەمیشە بێدار
دەڵێی سێوە دێرینەکانی باپیرمن
بەسەر کەلاری مێژوودا،
بەو تاڵە قژانە نووساون
بە شەوبا دەلەرێنەوە...



چرایەک لە حوسنی تۆ هەڵبووە
بوونەوەرێکی بێ سەرەتا و بێ کۆتایی،
نە لە خوا دەترسێ،
نە شەرم لە ئادەمیان دەکا
بە بەرچاوی با
بە بەرچاوی بەفر
بە بەرچاوی باران
ڕاوی پەپوولان دەنێ...
بوونەوەرێکی بێ سەرەتا و بێ کۆتایی
نە لە خوا دەترسێ،
نە شەرم لە ئادەمیان دەکا...

چرایەک لە حوسنی تۆ هەڵبووە
خەم نزیک  و نیشتمان دوور...
تەم لە دڵاوایی چاوی ڕێگا
بەرەو دۆزەخی تاریکی،
یا فیردۆسی نوور بچێ؟
من بە کوێدا بڕۆم؟

ئاسمان کوێر
ئاسمان لاڵ

من بە کوێدا بڕۆم؟
لەو هەموو سێبەرە
کام سێبەر هی خۆمە؟



چرایەک لە حوسنی تۆ هەڵبووە
هەموو قەڵەمەکان تێکەڵ بوون...
هەموو خەنجەرەکان، شمشێرەکان
تێکەڵ بوون.
نیگاکان ڕووەو ژوور
سەرەداوەکان پچڕاو...
چیا ،
نیشتمانی پایز،
دوا تاڵی شەفەق داڵدەی نەداین!
ڕووبار بۆ سەمای دڕکاوی
ئوتووی کراسەکەی تێک نەدا...!!

ئاسمان کوێر
ئاسمان لاڵ
ئاسمان کەڕ

من بە کوێدا بڕۆم
لەو هەموو سێبەرە
کام سێبەر هی خۆمە؟



چرایەک لە حوسنی تۆ هەڵبووە
ئاراستەکان لە نووکەوە بەرەونیگا
نیگا...
جێ پێی بەسەر فەرشی ئومێدەوەیە
نیگا
تامی پرتەقاڵێک دەدا
کە لە چاودا وەک هەتاوێک وایە...
نیگا
لە بەرەبەیاندا خەو دەیباتەوە...

چرایەک لە حوسنی تۆ هەڵبووە
شار تینوو...کولافە
شەقام لە وەرزی نمەکگیریدا
هاڕمۆنیای خاکەشین و مێرگی ترس...
برینەکان لەوەیان زیاتر پێ نەدەکرا



مانگ،
بێداری هەمیشە بێدار
چ پەیوەندی بە سێوێک هەیە
سێوێک هەموو دنیا تووڕ دەدا
پاشان کۆی دەکاتەوە...
مانگ،
چ پەیوەندی بەوە هەیە
پایز لە شاخ بووە یا لە شار
خەباتی ژێرزەمینی هەبووە یان نا ؟
مانگ
چ پەیوەندی
بەو بروسکە گەرمانەوە هەیە
هەمیشە لە باتی نان ودەرمان
لە هاوارمانەوە هاتوون...





ئەی هەوری نزیک،
گەوهەری ڕوناهی!
ئەی خانە خوێی میواننەوازی مەرگ!
سوپاکان بێرەدا ڕۆیشتن...
جوانییەک
هێشتا شوێنەواری مابوو
لەم ڕێگایەدا درایە بەر نێزان...
زامەکان وەکو خۆیان لێ هاتەوە!!
هەوری نزیک،
گەوهەری ڕوناهی
خانە خوێی میواننەوازی مەرگ!

شکۆمان بە ساتێکی فڕیندا
بۆیە لە ژاڵەمان زیاتر نەدی،
چاومان لێ دابگرێ
پیاڵەمان لێوان لێوکا...
بەم جۆرە ئیتر پێداهاتین
درەختەکانمان یەک یەک بڕین
تا لە چاومان ڕوانەوە...
(نوور)مان بە شەوی دەیجوور سپارد
هەوری نزیک، گەوهەری ڕوناهی
خانە خوێی میواننەوازی مەرگ...



خۆر ئاوا نەببوو
ئێمە بووین لە جوانی تێر بووین...
ئێمە بووین ڕۆژگارمان تا دواچۆڕ خواردەوە
خۆر ئاوا نەببوو...
هەوری نزیک، گەوهەری ڕوناهی
لەو ساوە،
زەردەخەنەیەک،
لە قووڵایی برینەکانەوە هاتووە
خەنجەرێک
لەگەڵ هەڵکردنی باهۆزدا هەڵکێشراوە...
پەیژەی ئومێد،
بە ئاوازە کپ کراوەکان،
بە مۆسیقای ناخەوە

لەو ساوە،
چرایەک لە حوسنی تۆ هەڵبووە
لەرێورەسمی خۆپیشاندانێکی ئاشتیانەدا
جانتای دەستمی پڕ لە شەوق کردووە
چاوچاو
چ شەوقێکی ڕەش و جوانە
لە دڵە بۆشەکان دەدرەوشێتەوە...؟
چاوچاو چ شەوقێکی بێ ترس و گومانە
لە لێوە بە بارەکاندا نوقم دەبێ...



چرایەک لە حوسنی تۆ هەڵبووە
سپێدەدەمان
گوڵەمێخەک،
دارەبەنەکانی پاڵ پاردە
بە سەمای ئەفسووناوی
شازادە لە خەو هەڵدەستان...
شار تینوو...کولافە
شەقام لە وەرزی نمەکگیریدا
هارمۆنیای خاکەشین و مێرگی ترس...

من ڕۆیشتم!
سەرم لە تاریکەبازاڕی ئاشنایاندا بەجێ هێشت
دامەوە کۆڵانە خۆڵەمێشیەکانی ئەکبادان
ئەفسووس
نە کەژاوەی سوڵتانم دی
نە بۆنی شازادە ڕوومەت گوڵیەکانم کرد
بەڵام گوێم لە مۆزارت بوو
پەردەی حەرەمی دەلەراندەوە...
ئەو دەمە تێگەیشتم ئایندەی پایز لە کوێرا دێ.
تێگەیشتم
چرا بۆچی لە حوسنی تۆدا هەڵبووە
ئەی هەوری نزیک...گەوهەری ڕوناهی
خانە خوێی میواننەوازی مەرگ.

**کانوونی یەکەم 2001**



## بەرەبەیانێك دەگەڕان مێژوو بکڕن

لە کەش و هەوایەکی دیموکراسیدا:
ماڵەکەمان سەربەشی ماڵان بوو...
کتێبخانە نووستووەکەم،
خوێنی بێ کۆڵێسترۆل و بێ گیروگرفت.
لە بەرەبەیانێکی گوناهباردا
مانگێکی شکاوە
بەسەر دەم و چاوە لۆچەکاندا دەرژێ
کە دەگەڕان مێژوو بکڕن...

ئاگردانی پڕاو
پارسەنگی کچێنی سەردەم،
هەتاوی تەمەنمان
لە سەرەتاتکێی شارستانیەتدا
کردووە بە تۆپێک نهێنی...
سیزیف..
سیزیف...
سیزیف....
دەگەڕێین مێژوو بکڕین...



فریشتە نووریان لێ ناکەوێتەوە.
بۆرە پیاو
پیاوی دالآنە نهێنیەکان
پیاوی هزرە مەڕمەڕیەکان...
لە بەفری مێژوو
لە وەهمی مێژوودا هاتوو
کەترە...
لە گومان و تاواندا ڕسکاو...
زمانی گەمە و خوێنکاری...
شەیتانی شەوە سوورەکانیان
بەرداوەتە سێبەر...





چاوی هەڵۆ ونە
دەنا باخەکەمان
بەری سێ ساڵانی پێکەوە گرتبوو
بێ دەنگی دەزرنگێتەوە...
پەپوولە ئارامیان لەبەر بڕاوە...

چاوی هەڵۆ ونە
چ دەکەن بکەن!
دنیا خۆشە و بێ دەرگایە......
چ دەکەن بکەن
با ئەمەش چاڵێکی تر بێ
لە ڕێگایێ
ناومان ناوە خەون.
لە بۆشاییەک
پێی دەڵێین(30) یا (100).



کڵۆی قەند
بەسەر زمانەوە دەتوێتەوە.
بە لەلەیی بێ یا بە پێناوی
گووپی خڕ کردووە...
گۆشتی چەناگەی شۆڕ کردۆتەوە.
هەواڵەکان وا دەگەیێنن...

ئیتر شاباش لە قوڕمیش
لە تیف تیفە و ئینتەلایی...
شاباش لە سەدەی بیست و یەکەم.



ئەوە دیماهی سرووداندنە
یا فەروای پڵنگێکی بەڵەک
بای پۆشتە کردووەو
چیای بڵندو
ئاوی بە جۆگەو ڕووباراندا بردووە؟؟
ئەوە ڕوومەتی شازادەیە
یا کولێرەی ناو زیندە خەونەکانمان؟

ڕەنگە ئەو کۆشکانەی بە کەللەسەر هەڵنراون
جوانتر بن...
ڕەنگە لە تاریکیدا
گەنجینەی زۆرترمان دەست کەوێ.
ڕەنگە سیمێکی لە هەندەرانەوە هاتوو
تەزووی گەرمۆکەو خۆشمان بداتێ
گەرمی دراوەکانیان ئاسا...
ڕەنگە وای لێ بێ
کردنەوەی بازاڕێک
خێری زیاتر بێ.
ئەو دەمە خەونەکانمان دێتە دی..
ئەو وەختە،
لە باتی ڕۆژی دوو نان،
سێ نان دەخۆین.
لە باتی ڕۆژی چایەکیش،
دوو چا دەخۆینەوە.



وڵاتەکەمان خۆشە
دەڵێن یۆرانیۆمی تێدایەو
شەهیدیشی تێدایە...

**1996/12**

# ئەشقیا

نیگایەکانت بە ڕەوتی نسکۆ
لەو ڕێگایانەدا پەرت بوون
فێڵیان لێکردین
بە داڵانە هێمنەکانی ڕۆحدا تێپەڕین
بێ ئاوڕدانەوە...
بێ لا لێکردنەوە
بێ ڕوانین
وێنەی گوللەیەک لە نیشانەدا سەردەکا
لە سێبەری لەزەتدا توانەوە...



نێچیرێکی ئاسان نەبووم
دڵێک بردمی،
بە ڕەوتی نسکۆ، بە کامی لەتردان
بەهارێکی بۆیە کراو
پەڵە هەورێک
لە چاوی منەوە هەڵکشابوو...

سوپاس بۆ با
سوپاس بۆ با
سوپاس بۆ با
نەیهێشت چاوم لە ئاسۆدا ببرێ
سوپاس بۆ با
دەنگی بەو چرایانە بەخشی
لە ناخی (من)ی ناو (خۆم)دا
بانگیان دەدا:
جیهان فریشتەیەکە لە پەشم
لەو زەمەنە درێژترە
گوڵێکی تێدا دەپشکوێ
لەو ڕووبەرە فراوانتر
بە مەزاری بێ سنووری
زیندەخەونەکانمان دیارە...



گوناه، ئەشقیای خانەگەردان
بەسەر کەپکی بێ ئومێدی و لەخۆنووسان
گوناه،
ڕێبواری شەکەتی چاوغایەنی هەڵوەدا
لە شەقامی کوژاوەو چۆڵی
ئێوارە درەنگان...

ئەمجارەش با لە دیدارئاخری تۆی پاراستم
ئەمجارەش با ،
لەو هەورانەی شاردمەوە
کە لە بن پێیان کەوتبوون...
سوپاس بۆ با
سوپاس بۆ با
کە هەمیشە ناهێڵێ
بازی کێوییان بگیرێ...





وەسیەتی ئەستێرەکان نەبوو
ڕۆژگار جێنووکی سپی
بە سیمای ماندوومان بەجێ هێشت...
وەسیەتی ئەستێرەکان نەبوو
خۆر لە نیگای تۆدا
ترس و گومانی بۆ باراندین.
وەسیەتی ئەستێران نەبوو
ڕێگاکان فێڵیان لە خەونەکانمان کرد
وەسیەتی ئەستێرەکان نەبوو...
ئەمە ڕەوتی باهۆزە ناوادەکانی
دۆزەخی زەمین بوو
لەگەڵ تەنیایی کزەبای سپێدە و
دڵە هەلا هەلابووەکان جووت دەبوون...

کێڵگەکانی شەو
بە مۆمەکانی بەرپەنجەرە ڕووناک ببوونەوە
تێشکانێکی شۆخ بوو
لە سیلەی سۆزەوە
بڕوانیتە جوانی
ماندوو...
هەناسەسوار...
لە باسکاندا ئاوا دەبێ...



گەمەیەکی بەسەبر بوو
بارانی مانگمان بە بریناندا دەکرد...
ئاگرمان لە قووڵایی ڕووباران کردەوە...

مەملەکەتێکی بێ شنە
بێ نوور بوو
هەموو پیشەسازی و دەوڵەتی
چەند کارگەیەکی وەهم بوو
کە لە ڕاست و چەپ
بە ڕاست و چەپ کاریان دەکرد

تێشکانێکی شۆخ و گەمەیەکی بە سەبر
لە سیلەی سۆزەوە بڕوانیتە جوانی
بڕوانیتە گوناه
ئەشقیای خانەگەردان
ڕێبواری شەکەتی هەڵۆەدا...
تێشکانێکی شۆخ...
گەمەیەکی بە سەبر...
تێشکانێکی ......
گەمەیەکی .......

**تشرینی یەکەم**-2001



## لەپرسەی (نا) دا

گۆڕی دوور لە مەرگ
پەنجەرەی کراوەمان، بەسەر باپێوی
وڵاتی بە مردن تێر و بەشتی تر ناشتا
ئامرازی پاکەوانەکان...

گوڵئەندام
لە پاڵ ئەوەی من وتۆ دەیزانین
ترسم لە ئاوی پەنگاوە...
لەم ڕێیەدا،کە زیاتر لە ئاوەڕۆکان دەچێ
ترسم لە تیغی تازە ساوە،
لە چەپڵەی گەرمی رەعیەت.
لە کۆڵانە ڕووتەکانەوە بەرەو پەرستگا ،
منداڵیی نیشتمان و
نیشتمانی منداڵیمان هەڵواسیوە...



بوونەوەری ڕەنگ داپچکوڕاوی
چاو زیت و کەمۆ
لە کەندووی بەتاڵ ئەکەن
سێ وەختەی ڕۆژێ، بۆش
کاسەی سمتیان داوەتە بەرخۆر...

گۆڕی دوور لە مەرگ
ئاسوودەییەک لە پێدەشتی چاونزیی و
بەدکریڤی و
تژی خۆهەڵخستن.

تەنگەڵانێکی بێ هاوتا.
زڵکاوێکی خومار.
لە کۆڵانە ڕووتەکانەوە بەرەو پەرستگا
منداڵیی نیشتمان و
نیشتمانی منداڵیمان هەڵواسیوە...

**1996/7**



# دەست لەکارکێشانەوەی ئەستێرەکان

**(1)**

ئەو ژنەی
لە ڕەنووی هزرە مایەپووچەکانەوە
کەوتۆتەوە..
ئەو ژنەی
ڕەشەبای پۆشیوە و
شەڕی سپێدەدەمان ئاگردەداو
چاو لە ئێوارە دادەگرێ...

ئەو ژنە حسابێک بۆ کەس ناکا
نە بۆ هێزی هاوپەیمانان،
نە ئەنجوومەنی حوکم...
بە نیلۆفەری چاوی،
هەموو هۆیەکی ژیانی لە شار بڕیوە...
ئەستێرەی لە ئاسمان خانەگومان کردووە
دەستی پێ لە کار کێشاونەتەوە...



لە میوانداری مەرگدا
کە خوێندنەوەیەک نامێنێ
با خۆی ڕووت دەکاتەوە
چیاکان سەر لە بن گوێی یەکتر دەنێن...
ژنێک ڕەشەبا دەپۆشێ
سپێدەدەمان ئاگر دەداو
چاو لە ئێوارە دادەگرێ...
ئەستێرە ئیتر هەڵنایێن...
دەست لە کار دەکێشنەوە.

**(2)**

من خەونێکی دیکەم نەبوو
ئەو ئازیزانەی خۆشم ویستن
داخ کە پێیان نەزانیبوو
لەگەڵ دەست لە کار کێشانەوەی ئەستێرەکان
ونم کردن.



**(3)**

لە خۆشەویستی دەپرسی
چۆن دێ و چۆن دەڕوا؟!
بۆ هاتنی خۆشەویستی هۆیەک نییە
خۆشەویستی هەمیشە دێ............

(4)

شارم بە چۆلەواری ڕۆحم سپارد
سۆز و چاوەڕوانیی و خەونی منالّیم
بەم دەم و دەستە لە کوێ بێنمەوە؟
کە خۆم ئاگرم دەکردەوە و
خۆم سڕ ببووم...
ئەو چاوانەی
تریفەیان لە مانگ دەدزی و
باری (نوور)یان
لە بەر ئاستانەی خەراباتان لێ دەخست
ئەو چاوانە
نسێی خۆرئاوا بردنی...



(5)

ئەستێرەکان
دەستیان لە کار کێشایەوە...
پێویستە چارەیەک بۆ ئاسمان بدۆزرێتەوە.
لە میوانداری مەرگدا
خوێندنەوەیەک نامێنێ...

**ئەیلول/2003**





# خۆشەویستی بەپێوانەی ڕێختەر

**(1)**

**پەڵە هەورێک لە شکۆفەی گریانی من پەیدا بوو/ڕۆیی ڕۆیی بەسەر کێڵگەی تردا باری/ئەو بێ ئاگا نوقمی شەقامە بەڤاوە ژاوەکانی لەزەت بوو/من لە کۆڵیتە هێمنەکانی ڕۆحەوە/ گڕوگاڵی پەپوولە ڕەنگاوڕەنگەکانم دەدی/نوکتەم بۆ ئەفسانە دەگێڕایەوە/ (با)م پۆشتە دەکرد و گەردانەم لە باران دەهۆنیەوە/**

سترانی ڕۆحی دەچڕی
هەناسەی لە لێواران شین بوو
لوتکەی لە بەفر یاخی
شکۆی لەسەر جادان کەوتوو...

(2)

**دڵی دوور لە خۆشەویستی/ دوور لە مەیل/ نزیک لەپیاڵە، لە کەیل بوون/ بەڵام تیشکێک بە پەیکانی بێ ئامانی شەهلاوە ئەوەتا لە دوور ڕا دیارە/ڕووبارێکی خەواڵووە/ لە ڕازێکی ئاشکراو خەیاڵێکی نووستوو دەچێ.../ دڵی دوور لە خۆشەویستی...تاسەی ئاڵودەیی/**

گریانێک لە چاوی هەڵوەدای ڕۆژپەڕ
دەڵێی هەوری هاوینانە،
نە پەرت دەبێ، نەدەبارێ...
شازادەی قامیشەڵان
نەشئەی سایە فێنکەکان...
بەفر دەیلاوێنێتەوە...
بەهار سڵاوی لێ دەکا...
شازادەی قامیشەڵان
قژی لە هەور دەسوێ
مەمکی لە نوور...



(3)

**ئەو کانیە بەختی لێ قووتداین/ڕۆحمان نوزەی لێ براوە، بە دوامانەوەیە بە ئاستەم هەناسە دەدا/درەخشانە... درەخشانە بەر ئاستانەی خەراباتان/تەنپۆڵایە ئەو بەفرە تەنپۆڵایە ناتوێتەوە/بەبیار بەبیار بەبیارانی/**

ئەو شۆستانەی
خۆزگە ناکامەکانی نیشتیمانیان لێ کەوتبوو...
کەس بە لایان دا ناڕوا
تەنیا
بێ ئاوەدنگ...
سەرکز... چاوەڕوان...
لە کێڵگەیەکی بەردراو
لە گوندێکی وێران ئەچن...
ناوی لە هیچ لیستێکی ئاوەدانکردنەوەدا نییە
ئەو سبەیەی لە خەونا دیبووت
ئاڵ بردیەوە...
ئەو بێ مەیلیەی لە کوخەکاندا دەژی و
لە تارمایی کازیوەدا دەردەکەوێ
بە ڕوومەتی چرچ و لۆچی لێرەواردا دێتە خوارێ...

سرووشت، سەرچاوەی پاکیزەیی
ئەو ڕێیە بەسامە نەبوو
ئاگردز نائومێدی و ڕەنجبەخەساری بۆ هێنا...
ئاگر دز...
ئاگر...دز...



(**4**)

**لە ڕەوتی باران بێزار نەبووم/ بزانە! من لە ڕەوتی باران بێزار نەبووم/ ئەو ڕەخشەی شەوانە دەیدایە کێو، شەیدا... درەوشاوە... ڕێگای ون کردووە/ لە شەتاوان دەخوولێتەوە/**
**شینگێڕ دیسان بۆچی کۆبوونەتەوە؟/ ئەو گیانلەبەرە خەمبارانە بەم نیوەشەوە بە دوای چیدا دەگەڕێن؟/ بڵێی ڕێگایان بدەن پەیژەیەک بە خەونەکانیان هەڵبنێن؟/**

هەست... بە تەسلیم بوونی نیگا.
خەون... بە ئاوازی سەقەت.
ژیان... بە بێ پێناویی و بێدەنگی.
نەوت... بە خۆراک.





(5)

**بیرت چۆن بۆدروست کردنی ئەو هاڕمۆنیایە چوو؟/ ئای لە سەدایێ پاییزێ/ ئای لە جواناوی شیعرە کەزی درێژەکان/ ئای لە ورشەی کوانوو/لە زەردەخەنەی هیوابڕاو/لە پەنجەی لە گۆچوو/لەزرینگانەوەی کەژاوە/ ئینجا ئای لە چی نا؟/**

گریانێک لە چاوی هەڵوەدای ڕۆژپەڕ
دەڵێی هەوری هاوینانە
نە پەرت دەبێ، نە دەبارێ...

خوایە بە دوعای چ هەتیوێک.
بە سوجدەی چ عابدێک.
بە ناڵە ناڵی چ نەخۆشێک.
بە شەبەقی چ خوێنێکی بە ناهەق ڕژاو.
ئەو دەسەڵاتە (بێدیماهی)ـەت بەعیشق داوە؟
لە شەختە چرۆ دەردەکاو
لە بەهاران دەیوەرێنێ...

خوایە ئەوە چ بەڵایەکە
بۆ عەبدی خۆتت ناردووە؟
ختووکەی ڕەهێڵە دەداو
چیا دادێنێ؟
چ بەڵایەکە
لە ڕۆشناییا زوڵمەت و
لە زوڵمەتدا ڕۆشنایی بەرپا دەکا...؟
خوایە... ئەوە...چ...بەڵایەکە...
بۆ عەبدی خۆتت نازیل کردووە؟

**حوزەیرانی/2003**



# تێلنیشان

**ئایا باشتر نییە وەگیر قاتڵێک کەوی**
**تا وەگیر خەیاڵی ژنێکی هەوەسباز؟**
**«نیتشە»**

**(1)**

**سنووری کۆچەریان لەو سۆزەوە دوای هات/پێخوستی ئەرخەوانی پێوە بوو.../سۆمای چاوم مینا بوو/سایە بێهاوتا...بێنەزیر/کنێر پاڵپشت/تەم بەرکۆژە.../تۆ نیگارێک نی مەکۆی سیحر و ئەفسانە/تۆ بێشەڵانێکی، جوانی و دڕندەیت پێکەوە تێدایە.../**

دنیا لە سەهەندی گومڕاییدا نووستووە،
ئەو پیاوە سادە و دڵپاکە نەبێ،
دەڕوا پێ لە دڵی خۆی دەنێتەوە...
دڵی شووشە
لە یاری پێکردندا شکابوو...

مارەزیو،
دڕندەی جەنگەڵان، پەسیوی پیلان...
مارەزیو شایانی تەلاری دڵ نەبوو
شایانی تەلاری میناںەند نەبوو مارە زیو...



(2)

**(کارێ)، لە هەیوانی ڕوونایی فرمێسکباراندا هاتووە.../ ڕووبەندی هەواداریە/گۆشەی ڕەشداگەڕاو/چاو کەوشەنی ئەوانی بڕیوە و بەردەوامە.../ (کارێ)، پاسارییە؟/نەء/کارێ هەناسەی ڕەشی سەردەمە؟/بەڵێ...**

نێرگسی گوڵڕەنگی بینایی بوو
فیراق نەورەسی تەنیایی...
نە دیواری خانەقا ما،
نە بەر ئاستانەی خەرابات
ئیدی مەدەدیار لە کامە ڕووگە
لە شەیدایان دەردەکەوێ...؟

**(3)**

**ژانری چی دادڕەس؟!/درەختی مەوسیمە/نادیدە.../تیری غەدر لە بەیان دەگرێ/تەتەر بە دەردیان نەخوارد/مۆسیقا... ئاواز/ لە کوێی مردنن...؟/**

خۆزگەکانم گوڵیان دا
گوڵنار چەتری خەرامان بوو...
ئەوە من نیم سنووری تەم دەبڕم
ئەوە ئاوێنەی (کارێ)یە
شەوق لە سۆز دەداتەوە....



**(4)**

**کێ وای کرد وێنەی خۆمان نەناسینەوە؟/توحفەییێک بوو لە مۆزەخانە/بەڵام هەڵنەواسرا بوو/هەڵپەسێردرا بوو.../ لافاویش هات/ئێمە هەر تینووەکەی جارانین.../زەنەکە.../ زەنەکە..زەنەک...**

چیا نایەڵێ بخەوم،
چیا نەیانهێشت بخەوم.
چیا تەماشامان دەکەن،
چیا تەماشایان کردین،
چیا دەبینن چ دەکەین.
چیا بینیان چمان کرد...
چیا ئیتر باوەشمان بۆ ناکەنەوە...
چیا ئیتر تێمانگەیین چ ماڵێکین...
چیا نایەڵن بخەوم...

## (5)

**باران بوو خۆڵەمێشی دامرکاندەوە.../بەی بوو/قوببەی**
**هەڵداشتە فرۆکەخانەکان.../هەورازێکی سەخت نەبوو/**
**ئەگینا شەو هەر من دەزانم چی پێ دەکردین/ئارێ!...**
**ماسکفرۆش بازاڕیانە/ئارێ (کارێ)یشی تێدا بەشدارە.../**

لەو دیو جامخانە شینەکانەوە دەیانبینم
لەو دیو جامخانە شینەکانەوە دیتنم...
لەو دیو جامخانە شینەکان،
دەستیان لە پرچی شیعرم نابوو
ئاگریان بەڕوودا دەپرژاندم...
بانگ هەر جارێک بوو:
خوداحافیز مەوسیمی خایین...

**(6)**

**فیراق پێشوتاری کتێبێک بوو/بەشەختە نووسرابووەوە.../ باڵ بە باڵدارانەوە.../وچان بە سیمای ماندوو.../«دیسان شەوهات»/ (کارێ) شەوبەشارە.../ئەرێ ماندوو نەبووی کارێ؟/**

سپێدە بەوازی ئێمە ڕوون دەبووەوە...
سپێدە بەوازی ئێمە ڕوون ببووەوە...
خەنەبەندانی ڕووبەند و
شینی سایەی ڕەشماڵان... بوو
سپێدە ئەی دڵ درێژدەبێتەوە...
درێژ دەبێتەوە...
درێژ دەبێتەوە...درێژ
تا دەستی بە بوولێڵ ڕا دەگاو
نایەڵێ تاریک دابێ...



# هەندێ لەو شوێن پێیانەی بەسەر شەختەدا مابوونەوە

**«مەکان شەوقی بە عێلاتە پەشمە کۆنە هەوار**
**حەیات زەوقی بە ئەحبابە بایە ئاووهەوا**
**حاجی قادر»**

**-1-**

ڕۆژگارم بێ تۆ سارد
لەگەڵ تۆشدا بە ئازار...
هەنگاوم بە ئاوازەکانەوە دیار.
ئیتر وابوو:
ژیان لە بروسکەیەکەوە هات
بە بروسکەیەکیشەوە ڕۆیی...

**-2-**

دەستەکان چوونەوە باڵ یەکتر
هێڵێک لە مۆمەکانی سەر تاخچەدا هاتبوو
مەرگی پەپوولە و گیانەڵای هۆشی بەدواوە بوو...
دەستەکان لە پاڵ یەکتربوون
ڕێگایەکی تر نەبوو...

**-3-**

گەرایان لەو ڕووبارەدا خستبوو
لە ڕۆژگارێکی تاریکدا
سنگیان دابووە خۆر...
کۆمەڵێ ماسی بوون کەس نەیدەناسین.

**-4-**

ڕۆژێ لە ڕۆژان
پەنجەم لە پەنجەی تۆ ئاڵان.
دەرگاکان داخرابوون
من هیچ کلیلێکم پێ نەبوو
کلیلەکان،
لە خانەی مەرگ پارێزرا بوون
ڕەنگە مردن لە جودایی خۆشتر بێ.



**-5-**

هەور
کوچە بە کوچە
شەقام بە شەقام
دەرگا بە دەرگا
بە دوای ناوونیشانی برسیەتیدا دەگەڕا...
لە خاکی نەزۆکدا
مرۆڤ تەنیا دەسەڵاتی بەسەر قسەدا ماوە.

**-6-**

لە سایەی بەفرەوە
بەرەو خاڵێک دەبینین و نابینین...
پەیژەی ئومێد بە ئاوازە کپەکانەوە
لاوێتی گریانی پێدا دێتەخوار...

**-7-**

مەرگ لە لەپی دەستێک دەچوو
بەزاری هەڵۆوە...
هەڵۆ ئاسمان تەی دەکا
مەرگ زەوی...

-8-

چەترێک بە دیواری نیگاکانەوە
ناهێڵێ چاوەکان
تارمایی گومان بیانگاتێ.

-9-

ژێی کەمانچەکەیان پساند
ئەی چاوی شێخ!
موحیبەتت لە چ کەندێکدا فڕێدا!؟

-10-

هەورازێک لە پرچی ئەودا بوو
سێوێک لە لێو و
دۆزەخێک لە چاوی...

-11-

خەونەکانمان هێشتا لە سندووقدان
وەرە پێم بڵێ
خۆشەویستی نەمردووە.
وەرە پێم بڵێ ئیتر وەختی نەما،
ڕووپۆشەکان هەڵدەگرین.



-12-

ئەو پەلکە گیایانەی
سێبەریان لە ئێمە کردووە
لە زەمینێکی بروسکەدارەوە شین بوون.
چ خەبەر کەژێ!
هەتاوی چاوت
ڕێ نادا چاوم لێک بنێم؟

-13-

شوێن پێ بەرەگەکانەوە دیارن
گریان ئەستێرەیەکی کوژاوە،
لە ئاسمانێکی سپیدا،
ڕەنگ دەداتەوە...
لە زەنگێکی برۆنزیدا،
دەنگ دەداتەوە.

-14-

هەور
لە بەینی پەنجەکانی مندا دزەی کرد کەژێ!
باران لە چاوی تۆ...
بەڵام پەنجەکان لە خاچ دران...

(خۆشەویستم)
لەو باوەڕەدای
بێم لە شانۆگەرییەکی ناتەواودا دەربکەوم؟

**-15-**

کولێرەیەک
بەسەر کەللەسەرەکانەوەیە
کەس لە هاواری باران ناچێ
باران لە مەیدانی شەڕدا بە تەنێیە
کلیلی دڵیان ڕفاندووە...
چاوە خومارەکان چاوەڕێی چین؟
چاوە خومارەکان بە دیارچییەوە دانیشتوون؟
باران لە مەیدانی شەڕدا بە تەنێیە.

**-16-**

وەک مەرگ
وێنەی ئاسمانی بێپایان
شینە کەژێ
لەو بەرۆکەوە بۆ ئەو بەرۆک
گوڵێکی ماندوو،
سیسە کەژێ!



**-17-**

هەموو شتێک وەک خۆیەتی
ئاوێنە،
بە ڕوخساری شەکەتدا هەڵواسراو
ڕەنگە دەرگای ئومێد
لە بەفرێکی پاییزی زیاتر نەبێ...
ئەرێ بەڕاست!
چڵێک لە ئینجانەی بەر پەنجەرەدا بوو چی لێ هات؟

**-18-**

پەنجەکان جوان بوون، ئاوازیان دەچڕی
پەنجەکان جوان بوون دەچوونە باڵ پەنجەی تر...
ئێستا پەنجەکان
بێ هودە لە هۆڵەکان هەڵدەبڕێن...
پەنجەکان...
ئاخ پەنجەکان...

**-19-**

گرێک لە قووڵایی کەلاوەکانەوە،
لە قووڵایی ساتە نەفرەت لێکراوەکان
گرێکی ماندوو،
فێڵ لێکراو...
بێ دەرفەت
ناسیمەوە کەژێ،
گڕی خۆشەویستی هەردووکمانە.



**-20-**

بەرد ڕەگی دەرکردووە...نابزوێ.
ئاو ڕەگی دەرکردووە... ڕێ ناکا.
چۆلەکە ڕەگیان دەرکردووە... نافڕن.
زەمین بێ ڕەگ ماوەتەوە.

-21-

بەرەواژییەکان پێکەوەن.
بەرەواژییەکان بەیەک ڕێگادا دەڕۆن،
لە یەک جێگادا لێ دەخەن...
بەرەواژییەکان پێکەوەن
وتار بۆ یەکتر دەخوێننەوە
چاو لە یەکتر دادەگرن
بەرەواژەکان بڕیاریانداوە پێکەوەش بمرن.
بەرەواژەکان پێکەوە دەمرن...



-22-

مانگ لە مێشکێکی پژاوەوە هەڵاتبوو.
ئەوانەی لە بانیژە وەستابوون
لە ناو گەڵای درەختەکاندا دەیانبینی
دەردەکەوت و ون دەبوو...

-23-

خاڵێک
هەموو ڕوناهی لە خۆیدا کۆکردەوە
گەڵاکان سێبەریان برد
چەکەکان خەون.






**-24-**

پیتەکان لە جەستەی تۆدا دەلەرێنەوە
وادەی چاوەڕوانی نییە...
کە لە گەڵتام هەمیشە دەڵێم جارێکی تر ناتبینمەوە...
چ سرڕێکە کەژێ!
تۆ بتوانی بە بێی من
لە خەونێکی پایزیدا نقوم ببی؟

**-25-**

تۆ لە حەقیقەتی ئاراستەکان نەگەیشتووی
هەرگیز وێنە ئەندازەییەکانی واقیع
شکڵی میوەکانی خەیاڵ نادەن.

**پایزی 2002**

# ئاوازە ماندووەکانی یەکەمی

ئاخ سنگی قووڵی ئەم بێدەنگییە چ پاک هەناسە هەڵدەکێشێ...
بڕوانە چلۆن گوێ رادەدێرێ ئەم بێدەنگییە پیرۆزە...
«نیتشە»



## – A–

وشە تەنیا باڵ نییە،
لەبەر پێی شازادەدا
بە سوپاس بدرەوشێتەوە...
پەرۆشیی،
کانگەی پێسپاردەیی و
ئاراستەی ڕێ پێ هەڵەکردن دەرچوو...
کەژێ، هەر لە دەستپێکدا
کێڵگەیەکی بەردراو بوو... دۆڕاوبوو...
کەژێ بەڕووبەندی وا دەردەکەوت
لە قەنەوزی گۆمە وەستاوەکانی دەکرد...
لە ساوی ئاو،
لە ئەندازەگیریی تۆزاڵی خۆلێگۆڕان...

له ده‌سپێكه‌وه،
چاوی لێ بوو
له تاڵ تاڵ و
سات و سات و
چڵی چڵی ده‌وروبه‌ر فێرببوو،
چاو له ئاسمان
ورشه‌ی مانگ له زڵكاودا نقوم بكا...



وشه نوخشه‌ی ختوكه‌دانی ویژدانه!
ئه‌شقیای به كێوكه‌وتوو؛
هاوڕێی (با )
هاوڕێی بارانه...

ئه‌وه نیگای هاوده‌م نه‌بوو
ڕوو له ئاسمان...
ئه‌وه چاوی ئاره‌زووبازی كه‌ژێ بوو
كه ده‌مگوت نه‌فره‌ت له ڕۆشنایی ده‌كا؛
خۆی له پاكدامه‌نی ده‌دزێته‌وه،
وا ده‌رچوو...

سپێدەی هاوین،
لە چاوی تەلیسماوی درۆینی کەژێ دا
گڕی دەباراند...
خەیاڵم دەکرد ئەو ڕاڕەوە
بە بێ تۆ نەچێتە سەر...
ئەستێرە بکوژێنەوە
جارێکی تر بەیان نەدا...
بەڵام وشە هەرگیز،
بوونەوەرێکی بە تەنێ نییە.
مەگەر جوانی و ڕەندی دنیا
لە کوێدا جێیان دەبێتەوە...؟!



بۆ ڕوناهی ڕێ
من وشەم بەسە.
تۆیش تا هەتایێ نوقمی
وەهمە لەززەت بەخشە،
ئایدزهێناکانی خۆت بە...!

وشە تەنیا باڵ نییە کەژێ!
کەژێ ی ژوورە تاریکە پەنهانەکان
وشە تەنیا باڵ نییە...
من وشەم بەسە...
کەژێی فێڵباز!

**2004.8.12**

**-B-**

گریان... ختوکەی خەیاڵە نووستووەکانی ناخ
لە بەهەستترین تەجەللایدا.
گریان وەجدی شەفەق و نامەی سپێدە،
لەو چرکە کورتانەی بنەوشەیی دەنوێنێ...
مرۆڤ چەندی پێویستی بە شیعرە، پێویستی بە گریانە...
شاعیر تا پتر لەکڵپەی ئاگر و
یەکتەنی شاخ و
تەوژمی باهۆز بگا...
دەبێ بگری...



گریان ئیکسیری دارایی ڕوناهییە...
شاعیران دەبێ بگرین...
تا خەڵوەتی نهێنیەکانیان گوڵی لێ بڕوێ...

بە نابەڵەدم مەزانە...
پێویستە قسەیەک لەو مەسەلەیە بکەین...
گریان... باڵی ئەو ڕەنگاڵانەشە
ئازادانە ئەم چڵ و ئەو چڵ دەکەن...
گریان... بارانی ناوەختی ڕێکەوتی خۆشەویستی و
ڕەشەبای جودابوونەوە و
هاواری برسیەتی و بەجێهێشتنی وار و نیشتمانیشە...
هەمیشە سەردەمی بێ گریان،
بە ڕۆژگاری بێئومێدی و هیوابڕاوی ناوزەد دەکرێن...
گریان... دەستەواژەیەک نییە،
مانای لێکبدرێتەوە،
گریان نیازێکە
وێنەی کەڤاڵی هونەرمەندێک،
بە کۆمەڵێک ڕەهەندی دیار و نادیار دەخوێندرێتەوە...



دەسا بابگرین بەسەر سێبەری،
ئەو ئاوازانەی گژوگیای بناریان بە عەشق دەنەخشاند...
بابگرین
بەسەر تارمایی ئەو خەونانەی بە شیعر دەستیان پێکرد و
بە شیعر کۆتاییان هات...

بابگرین
بەسەر جوانیەک
پێشەنگی کەژاوە و
چرای سەفەرە...

بابگرین...
ئاسمان چاومان لێ دەکا...
ئاسمان لاساییمان دەکاتەوە...

**2004.8.6**



**-C-**

نەژاد! خود لە بارێکدا نییە
ڕەهایی دەربڕێ...
ئیتر نەما ،
دیدار ئاخر بوون، جێی سەرنج بێ...
بەسەرچوون
ئەو ڕۆژگارانەی ماسک و ڕووبەند
هەر لە دووررِا دەردەکەوتن...

نەژاد! پێم کەوتۆتە سەر ڕەشانگ.
کەچی هێشتا
بەفر نایەڵێ
ئاسوودە سەرەخەوێ بشکێنم...
بەفر نایەڵێ چاوم بپشکوێ و
شەفەق و بووڵێڵ بگەیێنمەوەیەک...



هاوسەنگیی سرووشت
دڵساردی نەدەگەیاند...
ئەندازەگیریی
کارێک نەبوو لە بەرامبەر هەستدا کردیان...
مێرخاسی،
ئیتر ناوکۆیی(هاتیی) نییە،
ختوکەی ڕەهێڵە بداو
مەوسیمی چرۆ و نەوای هوزاران دەستەمۆ بکا...

با بەخەونەکانماندا بچینەوە...
وەختی هاتووە
بزانین چیمان لە بیر کردووە...
داوامان لێدەکەن
شەباقەی برینەکانمان کراوەتر بێ،
تا خوێنمان کەژاوەی مارینز و
یاریە خنجیلەکانی دەسەڵاتی پایتەختان،
ڕەنگینتر بکا...



بۆ نا!؟
پاکدامەنی
کەی لە ئەلف و بێی سیاسەت
جێی بووەتەوە...
ئەو غەیبە
بە کام سۆز کەشف دەکرێ؟

نەژاد!
هەڵەتێکە،
نازانی نە بڕۆی، نە وچانێ بدەی...
نە گیانی شەکەتت
بدەیتە بەر ئاوهەڵدێرێ
قیبلەنماییێکت پێنیە،
نازانی ڕووت لە کوێستانە
یا گەرمەسێر...



لەم ڕەوزەنەوە دەیانبینم،
چوارشانە،
بە ڕسکان ڕسکاون...
لێزمە و گەواڵە هەورانیش ڕادەگرن.
لێ چاوغایەنن،
بڕوایان پێ مەکەن...

ئەوە دەمگۆ نییە نەژاد!
ئەوە پەرتەوی نهێنیە درەوشاوەکانە...
لەم ڕەوزەنەوە دەیانبینم...
بە شەیدابوون، شەیدای خیانەت و دەرهاوردەکانین...
ئەوە دەمگۆ نییە نەژاد!
دەمگۆ نییە...

**2004.7.8**





## -D-

«فڕین بە فڕین دەست پێ ناکا.
ئەوەی دەیەوێ فڕین فێر بێ
دەبێ لە پێشدا وەستان و ڕۆیشتن و هەڵاتن و سەرکەوتن فێر بێ...»

نیتشە

لە وەتەی هەین
هەوراز دەمانداتە دەست نشێو،
نشێو ڕووبەڕووی هەورازمان دەکاتەوە...
لەو کۆستەوە بۆ ئەو کۆست...
خانەگەردان...
ماڵ بە کۆڵ...
بە ڕووباران خوێنمان داوە...
بە بڵندی چیایان کەللەسەرمان پژاوە...

ئێمە فڕینمان بە فڕین
دەست پێ نەکردووە...
لێرە...
لەسەر خاکی خۆمان هێلانەمان چێ کردووە،
لەو سەرەوە هاتوون
بێ ئەوەی غەدرێکمان لێکرد بن،
یا سنووری باخچەکانیانمان بەزاند بێ
لێیان تێکداوین...



ئێمە فڕینمان بە فڕین
دەست پێ نەکردووە...
هیچ نەما پێمان نەکەن...
ڕێگەی داهێنەرانەی وایان لە ئازاردان و
کوشتن و
ڕەشکردنەوەمان داهێنا
کەسنەکردە...
بەڵام ئێمە عاشقی ژیان بووین،
عاشقی هەتاو و خاک و باران بووین و
نەنووستین.

ئێمە فڕینمان بە فڕین
دەست پێ نەکردووە...
ئێمە بەرلەوەی
دەستمان بگاتە ئەو هێشووە،
زۆر چڵمان لە ژێر پێدا شکاوە و
کۆڵمان نەداوە،
خۆمان بە هی تر گرتۆتەوە...
ئێمە فڕینمان
بە خوێن و
فرمێسک و
بە تاوی گریان و
بە تەکانی هەڵات هەڵات و
بە چاوەڕوانی زیندان و
گەردەلوولی ئەنفال و کیمیاباران و
بە زوڵمی مێژوو و جوغرافیاوە دەست پێ کردووە.
ئێمە فڕینمان بە فڕین دەست پێ نەکردەوە.

**2004.3.8**



**-E-**

زیندە خەونن،
ئەو هاوکێشە ناهاوسەنگانەی
وەک ئینجانەییێکی گوڵ لە دەستمان گرتوون...
زیندە خەونن..
ئێمە گرێژنەی دەرگا تێکشکاوەکانمان،
هێشتا هەروا ماوەتەوە..
ئاهەنگێکمان بەبوونی، نەبووی
دەورو زەمانێکی زۆرمان نەداوە..

دەرچوو زۆربەمان،
لە بەرنامەی زیندەبەچاڵکردنی خەونەکان..
لە بەدنیهادی بێ ئەندازەی
وەفا و شەرم نەگەیشتبووین.
دەرچوو ئێمە سەهو بووین..
دەرچوو...(؟!)



زیندەخەونن،
ئەو کوانووانەی
لە دوکەڵ زیاتری لێ دیار نییە،
سەرسام..
حەپەساو..

برادەرەکەم، لە هەندەران دەژی..
گرفتی گەورەی ئەوەیە،
وەرزەکانی ساڵی لێ تێکچووە،

برادەرەکەم،
گەنجینەی بەردەرگای ماڵی خۆیان نابینێ!
چووە بەدوای ئەو گوڵانەدا دەگەڕێ
کە (لەوێ)
لەسەر تەرمی مردووانی دادەنێن..

ئەو لەوەتەی سەری هەڵگرتووە،
سەیری ئاوێنەی نەکردووەو
ئادگاری خۆی نەدیوە..
دوای ئەو هەموو ماوەیە
هاتبوو بە پەرۆشەوە
سیماو ئادگاری خۆی ببینێتەوە،
ئەو تا خۆی نەدیبوو
نەیدەزانی ئەوەندە ماندووە..
ئەوتا خۆی نەدیبوو
نەیدەزانی ئەوەندە ئومێد دزراوە..
ئەوەندە هیچیە..





زیندەخەونن..
ئەو مامەڵەت و سەروسەودایانە..
وژەی(با)ن
کاسیشی کردووین،
دوکەڵی کووانویش
کە دیار نییە لە ئاگرەوەیە بەڕوودا ئەدا..
بەخێر لە بەفرانباری تەمەندا
ڕەشانگمان لێ دەرکەوتبوو.
بەخێر خەریک بوو
هەنگاو هەڵێنین..
زیندەخەونن..
زیندە..خە..و..ن..ن.

**کانوونی دووەم 1995**



**-F-**

ڕێگاکان بەرەو کوێمان دەبەن؟
ڕەشەبا بە زمانی لاڵمانەوە؛
ئاسۆی مێژوو
ئاسۆی جوگرافیا
ئاسۆی ڕەنگ و مردن..
ئاسۆی سیاسەت و قیامەت..
هەموو ئاسۆییەکان
دەکرێن بە پێکێک و:
لە شەوە لاڵەکان
لەشەوە کوێرەکاندا هەڵدەدرێن..

ئەو پێکەشتان نۆش!
بە ئێوە چی
ژێیەکان دەپسێن؟
بە ئێوە چی
ڕوانینەکان هەناسە سوار دەکرێن؟
بە ئێوە چی
چیاکان خاکەشین بپۆشن؟



بە ئێوە چی
مەرگ و
دەنگ و
کوێرایی؟
بە ئێوە چی..؟

ڕێگاکان
بەرەو کوێیان بردین نیشتمانەکەم؟
ئەوە خەون بوو یان موتەکە؟
ئەوە پرخە بوو یا ئاوزنگ دان؟
ئەوە چەپڵەی
گرگنە حوجەکان بوو
یا فیکەی سۆزانییەکان..؟



نیشتیمانەکەم..
چی ما نەیاندەییێ و
چی ما پێت نەکەن؟
ئەوەی پێت نەکرابوو، پێیان کردی...
ئەوەی نەت دیبوو، پێیان دیتی..

ڕێگاکان
بەرەو کوێیان بردین؟
زمانی
چەکی ژەنگاوی قاچاخچیان..
ڕۆژگاری
سەرەتاتکێی
هەرچی و پەرچی و
ماستاوچی و
کارخانەچی و
چی و چی.. بۆ کوێی بردین
نیشتیمانەکەم،
نیشتیمانە لەت لەت و
بێ ئاسمان و
بێ چرا و
بێ ڕێگا و
بێ ئاسۆیەکەم...



ئیتر شەوتان باش!
کە خەونی منالآنتان
زیندە بەچاڵ کرد و
دوارۆژتان لەپێ کرد..
شەوتان باش
شەهیدەکانتان
جارێکی دی شەهید کردەوە...
شەوتان باش
شەوتان با
شەوتان
شەو...

**شوباتی/1995**

**-G-**

خەزێنە و دەوڵەت، لە بەر دەرگای خۆتە...
تۆ...
دەخوازێ هەوڵبدەی
بە هێزی دیاهینەهاتووی جوانی بچیتە مەیدان...

بۆ نایێن (وەزارەتی جوانی)و
(بەڕێوەبەرایەتی گشتیی جوانی) و
(کۆمپانیای سنوورداری جوانی) دامەزرێنین؟



کوردینە! وڵاتەکەی خۆتان نابینن؟
دەوەرن ئەمجارە
بە چاوی ناخ تەماشای کەن...
ببینن چۆن مێژووتان نەخوێندۆتەوە...
ببینن
چەند کۆڵەوار و
چاولەدەر و
بێ ئاراستەن...






نیگاتان بۆچی پەرت بووە...؟
ئەوەتا خەزێنە و دەوڵەت لە بەردەرگای خۆتانە...
ئای لە ئێوە!!
کە بە خۆشتان ناوەستن...
ئای لە ئێوە،
هەوڵنادەن جیهانبینییەکتان هەبێ...
ئای لە ئێوەی
بە جارێ
پێتان
لە بەری خۆزگە و مرازان بڕیوە...

بۆ کوێ دەچن؟
بە دوای چیدا دەگەڕێن؟
ئەوەتا خەزێنە و دەوڵەت
لە بەردەرگای خۆتانە...
چارێکی دیکەتان کە نەماوە...
یا دەبێ هەبن،
یا هەبن...



(ڕۆشنایی ناخە تیشک داوێ...
نەژاد بیانبینە، هەموو شتێکیان هەیە...
بیانبینە نەژاد!
لە هەموو شتێک بوونەتەوە،
ئیتر نازانن چی بکەن...
ئەو خەمەی یەخەی گرتوون
تووشی کەس نەبێ...
تیاماون لەوەی
بۆچی گوڵ بۆنی جارانی نەماوە...
بۆ ناتوانن وەک جاران
گوێ بۆ خوڕەی ئاوهەڵدێران ڕادێرن،
کە دەنگی هەندێکیان
وەک دەنگی وێککەوتنی
هێشوی ترێیان وایە...

نە تامی چا وەک خۆی ماوە،
نە دانیشتنی چایخانە و
پیاسەی ئێواران...
هەموو شتێکیان هەیە...
نە زەردەی سەران...
نە یەکەمین بارانی پایزان
سەرنجیان ڕادەکێشێ...
تیا ماون...
هەموو شتێکیان هەیە و،
لەهەموو شتێک بوونەتەوە..
نازانن چی بکەن...
بە ڕاستی شایانی دڵنەواییـن...
شایانی بەزەیین...)

**2004.7.24**



**-H-**

نەژاد سەیرکە!
دەفڕژەن
بە چ ڕوانین و جیهانبینیەک
لە مەداری کەشف و یەقیندا گیرساونەتەوە،
کە لە من و تۆ ونە!

نەژاد!
بڵێسە هەمان بڵێسە بوو،
تیشکی لە درەوشانەوەی جیهانئاراوە
بە ناو کۆڕی غەریب و ئاشنایاندا دەپڕژاند...

ئای کە نهێنییەکی گەواهیدەر بوو،
هاتین (پاکی)مان بە تەرازووی لاسەنگ کێشا ،
کەچی
هەڵەگۆیی بە تەرازوویەکی هاوسەنگ!!

ژەهرە گوڵنار نەژاد!
بادەی دوای نیوەشەوانی دەروێشی...
غەمزەی وشکە بڕواییە...
ڕاڕەوی یاساشکێنی...



لە نادانییان نەبوو،
دەفڕژەن
بەو ڕوانینە
وەهمی دادڕەسیی
بەرەو بارەگای نوور بە کۆڵدا دەدەن...

ژەهرە گوڵنار،
شارای زەمانی(قاتیی)یە...
نەشئەی بادەنۆشی کەنارەکانە...
چ هەڵپەیەکە
نیوسەدە زیاترە، دارا دارێکی نەدی...؟
لێڕوانین
لە قەڵەمڕەوی سرووتە ڕسکاوەکاندا کەنارگیرە...
شاش بووە،
بە دوای چەشەیێکدا دەگەڕێ
سەراپای لەخۆنووسانە...ونە...

دەفڕەن ئاشنان... نامۆنین
چەمی چاوان و
هۆشی مەستی و
ڕوناهی دڵان دەبینن...



وەنەوشەکان کە ڕازێکیان تێدا نەبوو...
ئەوە تەبعی هەڵبوون بوو
لە شەوێکی دەیجوور و نوتەکدا...
ئەوە ....
کانی زەمەندێکە
ڕەنگ بە پەلکەگیا دەداو
بۆن بە عەتر دەبەخشێ...
ئیتر چ بەرگرێک هەیە
دارستان لەگەڵ بوولێڵدا نەسووتێ...؟





دەفڕەن بێپەروایە،
دەخوێنێ و دەڕوا...
خۆشخوانی، کە شۆخی نییە برادەر...
برینی بێشەڵانانە،
نیگاری سۆز
باڵندەی بەرزەفڕو
سایەی چیلەمێو...

گەڵا
گەڵا
نەژاد بڕوانە!
گەڵا چۆن بوون بە ئاوێنەی وەرزەکان
دەفژەنیش بە گوڵی دیوان...

**2004.6.26**



**-I-**

چی بگێڕمەوە؟ بە تەنێ بووین...
بیابانێکی بێ پایان بوو،
بێ داد، بێ هانا...
گەردەلوول، پەیامی نیهانیی و
خەندەی لەسێدارەدراو...

چی بگێڕمەوە؟
ڕێکەوت سرووشت بەدەر بوو،
بەهانەگر، ڕاگواستە...دڵگەرم...
تۆ بڵێ خەونی ڕەهێڵە...
ڕامانی باران...
ئاوڕدانەوەی بەفر و
فڕینی سێبەر...

چی بگێڕمەوە،کاکە نەژاد!
کارخانەیەک بوو بۆ خۆی،
لە کزەبای بەیانیان پشێوتر،
سوختەی دڵڕەشان...
چی بگێڕمەوە؟
ئەو وەختی هەموو وەرزەکان
یەک وەرز بوون
بەڵام نازانم...
بە بیرم نەماوە  کام وەرز بوو...
ئەگەر بڵێم زستان بوو دڵنیا نیم...!
ئەگەر بڵێم پاییز بوو... دڵنیام نیم...!
ئەگەر بڵێم بەهار بوو... هاوین بوو
دڵنیا نیم...!!



لە بیرەخەو راچوو بووم،
ئاگام لێ نەبوو
هاتبوو دڵی ماندوومی
لە جانتاکەی هاوێشتبوو و
ڕۆیشتبوو...
کە هۆشیار بوومەوە،
دەستم لە سنگم کوتا، ئینجا زانیم...
لێ پاشی چی...؟ چی بگێڕمەوە؟
چی بگێڕمەوە.. کاکە نەژاد...

**2004.9.2**

## هەوڵە چاپکراوەکان

***1) لەبواری لێکۆڵینەوەی ڕۆژنامەنووسیدا***

* ڕۆژنامەگەریی کوردی و ڕۆژنامەنووسی کورد
نامیلەکە-چاپی 1984، بەناوی خوازراوی
(پاکزاد محمد کریم)، چاپکردن و بڵاوکردنەوەی یەکێتی ڕۆژنامەنووسانی کوردستان(لەشاخ)
چاپی دووەم بەناوی سەریح، هەولێر چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، 1991
* پرۆژەیەک بۆ دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە بەکوردی
لێکۆڵینەوە-گۆڤاری(ڕۆشنبیری نوێ) بەغدا، پایزی 1986
* هەڵەی چاپ، ئەمڕۆ ئاسۆی دوا ڕۆژ
لێکۆڵینەوە-بەدووبەش، ڕۆژنامەی (هاوکاری) بەغدا1988
* وێنەو کاریکاتێرو تایپۆگرافیاو بەکارهێنانیان لە ڕۆژنامەگەریی کوردیدا
لێکۆڵینەوە-بەسێ بەش، گۆڤاری (کاروان ژمارە 85و 86و 87)ی 1990.
* برایەتی: یەکەمین ڕۆژنامەی ڕۆژانە لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردیدا
لێکۆڵینەوەو بیبلۆگرافیا-چاپی یەکەم گۆڤاری(یەکگرتن) کە لە هەندەران دەردەچێ، چاپی دوەم چاپخانەی خەبات 1991. چاپی سێیەم چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەولێر-1997.
* ئاژانسی دەنگوباسی کوردستان(ئاداک-ADAK)
پرۆژەی دامەزراندن و بەڕێوەبردن
لێکۆڵینەوە-ڕۆژنامەی (برایەتی) بەسێزدە ئەڵقە، هەولێر-1993، چاپی دووەم بە کتێب چاپخانەی خەبات دهۆک 1997
* درەختی بنکۆڵکراو:
پەنجەنماییێکی ڕۆژنامەنووسیانە بۆ باری ڕووناکبیری و کلتووری کوردی چاپی یەکەم کوردستان-1995، چاپی دووەم سوید 1996.
* چەند وتارو نووسینی تر هەر لەم بوارەدا لە شوێنی جیا جیا بە کوردی و عەرەبی.

***2) شیعر***

* ئەو شەوانەی خەون نایێ:
چاپخانەی (النعمان)نەجەف-1977
* تاڤگەی مەند
چاپخانەی (شفیق) بەغدا-1987

* چەند کۆتەڵێکی جەنازەیی:
چاپی یەکەم- ئیتاڵیا -1994
چاپی دووەم- کوردستان- 1995
* هەندێ لەو شوێن پێیانەی بەسەر شەختەدا مابوونەوە-2005

***3) لەبواری وەرگێڕاندا***

* نووستوی بەر باران:
شیعر، چاپی یەکەم- چاپخانەی (علاء)بەغدا-1980
چاپی دووەم- کوردستان- 2005
* رێگاوبان
پێنج چیرۆکی درێژو شانۆنامەیەک لە نیکۆلای خایتۆڤەرە-چاپی یەکەم-
چاپخانەی (الحوادث) بەغدا-1983 بڵاوکردنەوەی کتێبخانەی حەیدەری.
چاپی دووەم-کوردستان-2005-دەزگای موکریانی.
* سەرتاییەک بۆ تێگەیشتنی هونەری شێوەکاری
چاپی یەکەم- چاپخانەی(حسام) بەغدا 1986
چاپی دووەم- کوردستان- 2005-دەزگای موکریانی.
* چەند نامەیەک بۆ تارانتابابۆ:
شیعری نازم حیکمەت.
چاپی یەکەم-چاپخانەی (الزمان)بەغدا-1990.
چاپی دووەم- کتێبی ئەرزان- سوید-1996.
چاپی سێیەم- کوردستان-2005.
* دایکی کورد-دانییێل میتران
لە عەرەبییەوە 1996 - چاپخانەی خەبات-دهۆک.

***4) کاری شێوەکاری (کۆلاژ)***

**** پایزی چاوەکان***
کۆلاژ لە تاراوگەی شیعردا -چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری-هەولێر 1998.
*** چاوەکان.. هەمیشە چاوەکان...**
کلاو رۆژنەیەک لە شەختەدا، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری 1999
5) (شرفە) بە زمانی عەرەبی، چاپخانەی خەبات- دهۆک-1998.
6) بێجگە لە دەیان شیعری وەرگێڕدراو و نووسینی دیکەو گۆشەی جیا جیا لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا لەکات و شوێنی جیاجیادا بەکوردی و عەرەبی.

ریزبەندی و پاش و پێش کردنی شیعرەکان بەپێی مێژووی نووسینیان پەیوەندی بە دەرهێنانی هونەرییەوە هەیە.

**Tavgey Mwndu**
**ewanitir**
**Diwan**

# The Still Waterfall

## and other Poems

**Poems & Collage**

**by:**
**Nazhad Aziz Surme**

**Contemporary Kurdish Poems Bringing Together the Following 4 Collections:**

1- **Sleepless Nights** (1977)
Najaf: An Na'aman Publishing House

2- **The still Waterfull** (1987)
Baghdad: Shafiq Publishing House

3-**Funeral Obelisks** (1995)
Duhok

4- **Some of Footprints that were left on the Frost** (2005)
Irbil: KRG Education Ministry Publishing House



دونیا شەو بوو
من بێ ئاودەنگ، بێ مەئوا
شەویش لەبەر گۆنای ئاڵی ئەم کچەدا
بێ پەنابوو..



(ڕێگای سەختی غەریبی خۆی گرتۆتەبەر
نازانێ کە لەم دونیایە بێ ئەنوایە
بێ دەنگی دەبێ بە پەنای بێ پەنایان..
نازانێ کە ڕێگای سەختی
غەریبی خۆی گرتۆتە بەر
دوای سێبەری خۆی کەوتووە!)

چ سوود که شار
دەبێ بە دەریای چراخان؟
چ سوود کە کەس ئاگاداری
سووتانی دڵی کەس نییە؟
چ سوود کە تۆ
لە سپیەڕۆژێکی وادا
دوای سێبەری خۆت دەکەوی؟
چ سوود.. چ سوود..؟





(2)

من دەمدیتن
گوێم لێیان بوو.
من دەمدیتن لە باڵەخانەی خەسرەودا
هەڵئەتووتێن..
من دەمدیتن پێکی خەمەکانی فەرهاد دەخۆنەوە
(هەزارە زیلەی مێرووڵەن
بەتەلانی شیعرەکانم هەڵدەگەڕێن)



من دەمدیتن دونیای ڕوونیان لێ کردین
بە شەوی ئەنگوستەچاوو
دەرگای سێبورییان بەستین..
من دەمدیتن.. گوێم لێیان بوو،
لە ترسانا:
چاوی زەق و
دەستی قامچی و
زمانی جوێن و
زاری تف بوون..

(بەچی چووەو
بەچی دەچێ؟
مێژوو لە ڕۆژگاری تاڵ و
شەوگاری خۆشەوە بەدەر
چی تیابوو؟
بەچی چووەو بەچی دەچێ؟)



کیژۆڵەیێ گۆنای گوڵی سپێدە بوو
هەوازەدەی سەمای نێرگزی کوێستان بوو..
بۆ شاری چراخان دەچوو..
بەچی دەچێ؟
شاری چراخان لە گوڵ دەترسێ..
شاری چراخان خامۆشە خامۆش
چووەتە ژێر باری خەوی دێوەوە
پاماڵی کەنیزەکانی
حەرەمسەرای سوڵتانە.



بەچی دەچێ؟
کەسێ ڕێگای غەریبی خۆی بگرێتەبەر..
دوای سێبەری خۆی بکەوێ؟

(3)
مەزڵم.. هەوارم، سێبەری پەڵەهەوری
بەهارێکی قات و قڕ بوو!
تاکە پەنای غەریبی و غوربەتیم تۆ بووی
تۆ مێرگی سەوزی کوێستان بووی
من بێزار بووم
تۆش پەنام بووی..
(لەم بەهارەیش قات و قڕتر؟
لەم ڕووخۆشیەش تووڕەتر؟
لەم هەرایەش کڕو کپ تر؟)



ڕێگای سەختی غەریبی خۆتت گرتووە
تۆ دوای سێبەری خۆت کەوتووی
بۆ
چی
دەگری؟
ئەم شۆرەزارە بە فرمێسک نارِوێتەوە.
مێژوو لە ڕۆژگاری تاڵ و شەوگاری خۆشەوە بەدەر
چی تیابوو؟!
تۆ کە لەم سپیەڕۆژەدا
دوای سێبەری ڕەشەوەبووی خۆت کەوتووی
بۆ، چی، دەگری؟

سەرهەڵئەگرم.
دەڕۆم بەدوای پەنجەرەیەکدا دەگەڕێم
سەرهەڵئەگرم.
جارێکی دی ناچمەوە ژێر
لێفەکەی خەوی مناڵیم...
دەڕۆم بەدوای کولانکەیەکدا دەگەڕێم
دەڕۆم.. دەڕۆم.. سەر هەڵئەگرم
ئەم شۆڕەزارە بە فرمێسک ناڕوێتەوە.

**1983/6**



# ڕووشی بەرهەتاو

**(1)**

لەگەڵ ترپەی، دڵی ڕووخاوی ترسنۆکێ بووی
دەڕۆیشتی گوڵی ئومێد لە بەرۆکی یەئس بدەی..
ئاوی حەیاتت دەدایە مردوو
تەوێڵی خۆت خوێندبووەوە:
(ئەم پایزەش دوایی دێ).

ئەو بەهاریش دوای دێ!
تۆ خۆتت لەبیر چۆتەوە..
پایز هێمای وێران بوونی
ئەم سرووشتە دڵئاوێز و شۆخە نییە.
تۆ نازانی
تۆ خۆتت لەبیر چۆتەوە..

**(2)**

ڕێگا دوور بوو، قۆناغ دوورتر
پێیان وتی:
بۆ نایێی ئەمە بکەی بڕۆی
لەناو خۆتدا بێیە دەرێ..
تۆش لەلاییێک قەڵەمی ئەژنۆت شکابوو
لەلاییێکیش داگیرسابووی..
لە غەیری ئەستێرەی سرکی بەربەیانیش
کەس یاوەری ڕێگای سەرگەردانیت نەبوو..



(تۆ خۆتت لەبیر چۆتەوە
تۆ لە نهێنی خەڵوەتی
ئەم پەردەنشینە ناگەی..
ئێستا (دیمترۆس) ئەوە نییە
وەک ئەکتەرێ ئەم شانۆیە جێ بهێڵێ
ئێستا گورگێکی بریندارە
بایەقۆشی سەرەخۆرەیە،
دەخوێنێ تا خوێن سەر دەکا
دەخوێنێ تا زمانی دڵان لە گۆ دەخا
تۆ خۆتت لەبیر چۆتەوە..)

(3)

لەگەڵ ترپەی دڵی ڕووخاوی ترسنۆکێ بووی
ئەمجارەیان
زاتت کرد برۆی ئەم ئەڵقە بەتاڵە جێ بێڵی
بەڵام ئەفسوس..
پاکی زەویت لەخۆ کردبوو بە زڵکاو
نەتدەتوانی پەی بکەی!





تۆش دەهاتی پێت لە دڵی خۆت دەنایەوەو
جارێکی دی،
جەستەی لەرزۆکت دەچووەوە
دالآنەکانی قەڵای شەو..
نەتدەزانی سەردەمی هەڵات هەڵاتە
نەتدەزانی کە خۆتت لەبیر چۆتەوە
چونکە لەگەڵ ترپەی دڵی ڕووخاوی ترسنۆکێ بووی
چونکە پووشی بەر هەتاو بووی.

**1982/9**



## پاردە

تەڵەزمێکی کێشەکە بوو
لە شیعرێکی تەواو نەبوودا هەڵبببوو.
فرمێسک بوو
ڕەنگ و دەنگی نزایێ
کە پۆڵاش دەتوێنێتەوە..
بەڵام ئەفسوس،
درەختێکە لە ڕەگی خۆیدا پچڕاوە
تانەیەکە بەچاوی هەورەکانەوە
ناهێڵێ باران دابکا
چڵەکان تەرزی نوێ بدەن..
تەڵەزمێکی کێشەکە بوو
بەڵام ئەفسوس..

**1986/6**

## ئەم زریانە شێتە (1)

هەناسەی من کزەبایەو قژی تۆش
ڕەوێ وشەی سرک
وەک ڕووبارێ گڕ تێبەربوو،
خۆزگەی لوتکە بەفرینەکان
دەوروژێنێ وناوروژێنێ!

(چراکان هەڵایساون
شەقام وەکو چاوی ئەستێرەکان ڕوونە
عەشقی هەتاو
گیان لە خوێندا شەڵاڵ دەکا..)
من بە هەناسەم.. هەناسە
قژ لەسەر ڕووتا لائەدەم
خوێن لە عەشقی ڕووباردا ئەتوێتەوە..



بەتەلانی خەمی خۆیدا هەڵدەگەڕێ
خلۆر دەبێتەوە..
تل ئەداتەوە،
تاودان.. هەناسەبڕکێ.. تاودان.. هە.. نا..
سە.. بڕ.. کێ.. تا.. و.. هـ...نا..
نوزەی لێ دەبڕێ....

(کێ بێ گوڵئەستێرەی وشە
لە شەوی تاری شاعیردا بفڕێنێ؟)
ئەمە ڕووبارە!
تاشە بەردەکان وەک دەستاڕ
پەراسووەکانت دەهاڕن.
هەموو شوێنێ ـ سیپان ـ نییە
ژانی برینە گەشەکانت، ئاوێزانی،
سێبەر و سۆزی ـ خەج ـ ێ بێ
ئاگات لێیە لە چ گێژەنێک خول ئەخۆی؟



ئاگات لێیە کە خول ئەخۆی و ناخنکێی؟
(لە گەرمیانی دڵی بەکوڵ گریاومدا
ڕەشماڵی کوێستانەکانت بۆ هەڵئەدەم
دەبم بە چڵی هەتاو و
خۆم بە تەزووی
دڵی شکاوت وەدەکەم.)

بەرەو سەرچاوەی بناری لوتکە ون بووەکان مل دەنێ..
وشەکان:
«مرواری بەر تریفەی مانگەشەو»ن
دەست دەبا
خۆیان بە کەفی شەپۆلدا هەڵدەواسن و ون دەبن..
کێ بێ ئەم زریانە شێتە بخەوێنێ؟
خەو (شیرین)ـە، دەبێ بەچڵێ تریفە..
کێ بێ ئەم زریانە شێتە بخەوێنێ؟
فەرهاد جۆگە لە بەردەڵانا لێ ئەدا..
کێ بێ ئەم زریانە شێتە بخەوێنێ
شیرینیش لە دڵی فەرهاد
ڕێی ڕووناکی هەڵدەبەستێ.
ئەم زریانە خونچەی چاوت دەپشکوێنێ.

هیچم ناوێ
دڵەکەم لە ئامێزی شەیدا هیچم ناوێ
تەنیا وەرە
بۆم ببە بە خۆری شیعرێ و
لەگەڵ گەردی بەیانیەک
تەزووی ئۆخەم بۆ بهێنە.
ئەم جیهانە بێ گۆرانی ئەستەمە
گیانە وەرە ئاوازێ بۆ ئازارەکانم دابنێ..



## ئەم زریانە شێتە (2)

زەوی دەنکە حەبێ نییە
ئەویش ئافرەتێ بێ هانا، بێ دەرەتان.
ئەمە زریانە کوێراییتان دەکاتەوە..
هەوری گریان و گۆرانی
بە ئاسماناندا دەفڕێنێ.





ئەمە زریانە،
«بێ دەنگ بن گوێم بۆ دڵم ڕادەدێرم»
گوڵئەستێرەی وشە ئەمشەو بەڕەڵڵایە
هەتاو بەسەر شەوەزەنگ و شەختەی شیعردا دەبارێ..
نەء.. دنیا بە باسەرابی ئاسۆی لێڵتان نابزوێنرێ..
خۆری شیعر،
ئەم جوانییە کوشندەیە
دەرزی نێو کادانێ نییە
نیهان نادرێ..

(لە درەختێکی تەنیا دەکا
بە پشتی شاخێ ڕووتەوە..
لە نێرگزی پشکوتووی چاوەکانیدا
پایز نەورۆزێکی نوێیە.
نهێنیەکی شیعرئارایە،
جاری وایە لە سێبەری مێروولەییێک پاڵدەکەوێ
جاریش هەیە هەموو دنیا بەشی ناکا..)

چی ناو دەنێی؟
ئەم زریانە شێت و شێتە، چی ناو دەنێی؟
نووری خوایی
یا چەند ساتی کورتخاییێنی دنیایی؟
چی ناو دەنێی؟
باڵای شیعر
یا گۆرانیەکی ئاوارە..؟

**1981/1977**



## سێبوونەوە

**(1)**

گەڕانەوەی بارانە.
بەهمەنی بەفرە سوورەکە
کەس نەما ڕاپێچی نەدا،
کەو
ئاسک
کارە وردیلەکان،
تەنانەت چاوەڕوانی و
شەرمی ئەفسانەیی کچانی لادێش...
کەس نەما.. (کەڵ) نەبێ.
ئەوەی نهێنی لەلابوو
بێ یاوەر.. بێ هاواروبانگ
بێ نژدەوان بوو..
وەسا بوو
پڵنگێکی ماڵیی، پاسەوانی تاریکی
تۆی تیا نووستی، نوقمی نەبانی..
شاش ببووی، بێ ئامان.

**(2)**

گەڕانەوەی بارانە
ئاوەدانییە.
بێدار بوویەوە:
خۆت تەنیا بینی:
(ئەوە برادەرایەتی نییە
هاوەڵەکانت جێت بێڵن..)
بۆ کوێ دەچن؟
وەرزی گەڕانەوەی بارانە
ئاشی دیان پێ نانرێتەوە
فێڵ بوو..
(هیپۆمینس) بە هێزی بازوو
گرەوی لە (ئەتلانتا) نەبردەوە
هیپۆمینس گرەوی لە بایش دەبردەوە.
ئەتلانتا خۆی وای دەویست
ئاشی دیان پێ نانرێتەوە
وەرزی گەڕانەوەی بارانە.



**(3)**

ئاهەنگی جێژنی لەدایک بوون نییە
گەڕانەوەی بارانە
پێوەدان نییە
چزووی پەشمەستی بەفراوییە..
خەمەکان بڵاوبوونەتەوە..
مەیدانی سێرک چۆڵ کراوە
خەبەرت هەیە (کلۆدیۆس)
لەسەرەمەرگایە.. دەمرێ؟

**1986/1**

## پەیوەندی

(1)

دوو لوتکەی دوو کێون
بەفر هات
ماچی
ڕووباری
شێتی کرد.
تۆلازی ڕۆما
دێن سەری (ئۆڤید)ی شاربەدەر
دەبڕن و
دەیخەنە (دەریای ڕەش)ـەوە



(2)

زێڕوەشێن خەنجەری لەکایە.
بۆ ئەو باڵی شەکەتی قەقنەس سەمایە!!
سەمای دەسماڵان..
زێڕوەشێن خەنجەری لەکایە.

(3)

درەختی نایلۆنی بەر پەنجەرەکە
چوار وەرز تێک دەکاتەوە.
ئەو درەختە
دارپەشیمانی (ئەپۆلۆ) نییە
خەونی بزرکاوی
زیندووە، مردووەکانە
کە دوو لوتکەی دوو کێوی
تیا پێک دەگەن.

1985/10

# ئەزموون

*[ئەم هۆنراوانە دەگونجێ لەگەڵ تاقیکردنەوەی دی وەک (پۆستەرە شیعر)و شێوازی وەک (هایکۆ ـ HAIKU)ـەوە پێڵوز بکرێن..*
*من بۆ ڕوونکردنەوە دەڵێم: هیچ کامیان نین، بەقەد ئەوەی هەوڵدانێکە لە کێشانی چەند تابلۆیێک بە هۆیێکی دیکەی دەربڕین..]*

- **هێلانە**

شەباقەی برینە،
یا چاڵە خوێنە،
یا دەمی بورکان.



- ***(....)***

کلاورۆژنەیەکی شیشبەند
چەند تاڵە تیشکێ
مرۆڤێ دەستی بە قاچییەوە گرتووەو
سەری بەدیوار هەڵپەساردووە.

● **ئاواز**

پۆلێ گەڵای سەوز
بە هەوادا دەفڕن.
باران نم نم دەبارێ
دنیا بەرگی سپێدەی لەبەردایە.



● **ستیڵ لایف**

درەختێ راقەناو
کەلاوەی خانوو
باوڵێ تەنەکەو
لێفەی شڕی لەبیرکراو..
ئاژاڕی چەند چرۆیەک
بەسەریانەوە بایەقۆش
گۆرانی شێوێندراوی
چاخی تیخبەند دەچڕێ.

● **(....)**

چاوی سەرسام
چاوی زەق
چاوی نوقاو
چاوی نەرم و
چاوی تیژ
کۆمەڵێ چاو
کۆتکێ لەسەری ڕژاوە.



● **برسیەتی**

گوڵەگەنمێ
پەیژەیەکی پێوەنراوە
گورگێکی پێ هەڵدەگەڕێ.

● **شەوق**

نیشانەی پرسیار
بەدەوری دڵێ خوێنی لێ دەتکێ.
ئاسمان گەشە
دەستێ ڕەگی دەرکردووە..

● **سووتان**

دوکەڵێکە
چاو چاو نابینێ
کەویە بەفرێک دەسووتێ.

**● ڕوانین**

(1)

کۆڵکەدارێکی قەراخ ڕووبار
ژنێکی ڕاکشاوە.

(2)

ئاگرێ دێ
ئاگرێ دەڕوا
بە دوو ئاگر
دنیا تاریک داهاتووە.

(3)

مێزێک
چایەک
پاکەتێ بەغدا
هەندێ شوێن پێی بچووک و
هێندێکی دی زەبەللاح..



**● دڵنەوایی**

کچێ ڕەشپۆش
لەسەر بانیژە وەستاوە
تریفەی مانگ و
ورشەی ئەستێرەی ئاوابوو
کۆ دەکاتەوە.

**● دیوارەکان**

دیوارێ.. دوو دیوار.. دە دیوار
چیمەنتۆبەندەکان ڕووخان
تەنیا دیوارێ قوڕ ماوە
نەڕووخاوە..

**● ئێش**

ئاسمان دڕکی لێ دەبارێ
زەوی دڕکی لێ شین دەبێ
خۆرێ دڕکاوی هەڵاتووە.
دڕک.. دڕک
لە هەر چوار لاوە دڕک.

● ***(....)***

لەناو ئەو هەموو قەڵشت و بۆشاییەدا
کە دەگونجێ بوومەلەرزەیێ
پێکی هێنابێ
پنتێ سەرنجت ڕادەکێشێ.

● ***بروسکە***

دوو دەرگا
دەرگایێ داخراو
یەکێ کراوە
تارمایی مرۆڤێکی سەرگەردان.

● ***گومان***

سێبەری ئەژدیها
پەڵەیەکە، ڕەش و نارێک
بەسەر چەقی دووڕیانەوە.



● ***سەنگەر***

بانێک
بێ کۆڵەگە، بێ دیوار
بانێک ئاسمانیشی بەسەرەوە نییە.

● ***زەنگ***

ڕەوەمەلێکی بەرزەفڕ
لە شکارتەیێکی ژەنگگرتووی
ئاسمان دەکا.

● ***(....)***

چیایێک خەریکە دەڕمێ
چەند دەستێ سنگی خۆیان داوەتەبەرو
ناهێڵن..
چەند دەستێ ناهێڵن چیایەک بڕمێ.

### ● تونێل

چوار بازنەی بچووک
بەدەمی گورگەوە.
چوار بازنەی بچووکی
نێو بازنەییێکی گەورە.
زریزەیێکی ژەنگاوی
لەو ناوە لوولی خواردووە..



### ● ڕوانین

هێڵێک ئاسۆی لە باوەشی خۆی گرتووە.
ڕووبارێکە
دەشێ ڕەگی درەختێ بێ
یا هەر سەراب و هیچی تر.

### ● پۆرترێت

کۆمەڵێ جۆگە
دوو کانی وشک
تیشە بەردێک
سیمایێ ماندوو، دوو باڵی
لە ڕاست و چەپدا ڕواوە.



### ● مانەوە

کۆخێکی بەپێوە ماوی
نێو دڕاڵەی شاخ
شوورەیێکی گڵکۆیینی
بەدەوردا کێشراوە.

### ● (....)

تەرمێک لەسەر دەم کەوتووە
چرایێک کوژاوەتەوە
درەختێک بەلادا هاتووە
زەوی و ئاسمان لە یەک نزیک بوونەتەوە.
بارانێ سوور دای کردووە.

**1986/1985**



# چەند کۆتەڵێکی جەنازەیی
## کۆشیعری سێیەم -1995-دهۆک

پێشکەشە:
به ڕۆحی بەفرینی دایکم
قوربانیەکی تری دەستی وردە دیکتاتۆر و
ستەمکار و داخ لە دڵان..
ئەوانەی هێشتا زۆریان ماوە تێ بگەن، چ تاوانێکیان کردووە...
1995/9/25



## ولاّتی ناو دەنکە هەنار (1)

گڕی ئاگر، لە داگیرسانی چاوەکان تواوەتەوە
لێڕەواری نیگاکان لە سۆمای بارانێ چەقین.

تۆ لە کوێی ئەی نەشئەی ئاگرین
سەرەنگرێی شەفەقی پەژموردە گڕ بدەی؟!
چەندی دی (پنلۆب)
چاوەڕێی کەژاوەی بێ سەرو شوێن و خەبەر بێ؟
(ئەسینا) ناتوانێ بەیانی ئەم چاخە بەربدا
(ئەسینا)ش خەونێکەو چیتر نا...

ئەوەی ڕۆیشت ڕووناکی لێ دیاربێ؛
سێبەری بن باڵی (هوما)ی تۆی بەدی کرد
دێ ملی ڕێ دەگرێ...
چەندی دی پنلۆب بێ خەبەر
چاوەڕێی کەژاوەی بێ سەر بێ؟!



شەوق لە ژێر گڵدا پێ ناگا
شەوق لە ژێر گڵدا ڕەونەقی نامێنێ....
ئەی تاوی بارانی دڵشکاو، چەندی دی؟
تۆ لە کوێی؟؟

**1988/7**






# ولاتی ناو دەنکە هەنار (2)

***(لەو دیو دێوجامەی نائومێدیدا گۆڕستانەکانیان ئاوەدان دەکردەوە...***
***چ خەمت بوو! هەردوو چاوت گیرابوو***
***جێی تاڵە هەتاوێکیان تیا نەمابوو...***
***(ئیساکا)ت لە چاوێک و (پنلۆپ)ت لە چاوەکەی دی هەڵگرتبوو..)***

**(1)**

چۆلەکەیش هێلانەی هەبوو
شەوان سەری غەریبی خۆی پێ دەکرد..

بێ مرادی،
لە کاروانسەرای (شکۆ)وە دەستی پێ کرد..
ڕەزمگێڕان،
تاسەی کروزانەوەی وڵاتێک بوون
نەتەختی هەبوو نە تەلار
لە بێپەروایی زەمەندی خەونەکانمان نەخشابوون...

(ئەوە وڵاتی من نییە وەرزبازیی
وێنەی تنۆکە ئارەقێک
بەلاجانگی دێتە خوارێ...
ئەوە وڵاتی من نییە،
چۆلەکە لەبەر خۆریا مەلە بکەن و
بارانی لێ نەبارێ...)

تەمی سەر گەشتەیی نەبوو ئەوە کریڤ!
سنگی پێ گوزەر
تیلاکی ناکامی



شەوقی چاوەڕوانی و
(باران)ی دۆستی هەژاران بوو...
درەوشانەوەی تارماییەکان،
توانەوەی ڕەشەبا بوو...
مەگەر نەتدی ...
خونچەی بە چڵان و
بارانی بە هەورانەوە نەهێشتبوو...
مەگەر نەتدی؟
چەند ڕەش بوو....
بەچلێ هەتاو توایەوە؟
مەگەر
نەتدی...؟

(مەڵبەندی دنیا نەبوو ئەو
شەوێکی درێژدادڕ بوو...
بێزاری بوو تا ڕادەی
بێزاری شەو...)

تەنێ  ئاڵای سەری خۆی بوو
تەنی من بوو..
جامێ لە دەست شازادەی ساماڵتان نابوو
خوێنی من بوو..



تۆ تەماشا!
ئەو زادەیە بێ وێنەیە
بە چ ژانێکی گلاراو لەدایک بوو و
ماڵئاوایی لە نیشتمانی برینەکان کرد..
تەماشا!

لە ئەشکەوتی سڕ و بن تاوێران..
لە چاوی هاوڕێکەت بەدەر
یاوەرێکی دیکەت نەبوو..
تۆ هەر ڕووەو بناوان کشای..
هەبوو هەر زوو چیرۆکەکەی دوا پێ هێنا
تۆ هەر ڕووەو بناوان کشای..
ڕووەو شکۆی گوڵڕەنگی ژیان
ڕووەو حەقیقەتەکان هەموووی...

**1991/12**



**(2)**

لە شەقامە سەرمەدییەکانی مێژوودا
پیاسەت دەکرد..
ساڵی دوو زستان و
سێ زستان و
چوار زستان و
پێنج زستانت دی..

# کەش و هەوا

**(1)**

ئەسپەکان تەراتێنیانە..
گەردەلوولی سمەکانیانم لێ دیارە
گێژەنێکی سەرەوژوورە؛
گیزەی بەفر،
لە هەناسەی سواری ڕێبواران وەردەدا..



کۆستی ماری ئارەزوو شکێن
دێ دەبێتەوە ئەفسانەو
بەیانیی مێژوو بەردەدا..

**(2)**

چ ئەستێرە لە ئاسمانێدا نەڕژابوو
چ کیژێ پرچی نەبڕیبوو..

نە ئەو مەلی بێ مەفتەن بوو،
نە ئاشیانەی تورەکەڕێژ..
بەیداخە ڕەش و سپییەکان چۆن هەڵدران؟
مێرگی سۆتەڵ و ئەرخەوان
ئەو هەموو شیعرە جوانانەی چۆن لێ ڕوان؟






**(3)**

ئاسکەکانم تارماییان دی و
تێیان تەقاند..
خوایە هەرگیز
ئاگرودوویان لە ماڵێدا نەکرێتەوە
ئاسکەکانمیان ڕاچڵەکاند.

**(4)**

گوڵەکان هاتن؛
پێچەکی بارانییان لەسەر نابوو..
بە چل ئاواز دەیانخوێند و دەیانگێڕا

بەڵام ئەوان باران شۆر بوون، ڕانەچەنین
گریان..
پێکەنین..
گریان..
بە نەورۆز کەوتن..



خەونیان دی:
ڕووبارێ زێڕ بە نێو تاسەی تینوویەتیان ڕێی گرتووە
کولێرەی سووری پێدا دێ..
گریان..
پێکەنین
بە نەورۆز کەوتن
باران شۆر بوون ڕانەچەنین
بەردەوام بوون لە خەوبینین..

**1987/6**

## خەون

(شەو) لە ژێر لێفەی هەورەکان ئارامی گرتووە..
ئاوازی باران پروشان..
شازادە چاوی بە کرێوە ڕشتووە..
قامیشی لێواری (ئابزۆ)ی پۆشیوە..
بەخشڵی پەرستگای پاییزیی (ئینەننا) خەملێیوە..



بەیانیش بەم شکۆو بەرزییەوە
باران دێ کێشمانەی خۆی دەداو
چارۆگەی ڕێژنەدار،
بە کێڵگەی سکداوی دموزی دادەدا..

(ڕۆژ) لە ژێر سامالی چاوی گەش کەوتووە..
کڵپەی گیان سووتان.
شازادە ڕووت و قووت
لەبەردەم حەفتەمین ئاستانە بارانی پشکۆی لە چاوە..




هەر بینا شەو داهات
هەر بینا تریفەی حەفت ڕەنگی شازادە
ختوکەی شەوی ژێر لێفەی هەوری دا.
هەر بینا کڵپەی گیان سووتان
بەیانی (ئور)و (نیپۆر)ی بەردا.

**1987/4**

* ئابزۆ (ABZO) ئیشارەتە بۆ ئاوە ئەزەلیەکەی سەربردەی خولْقاندن.
* ئینەننا (nin-an-na) کچی ئاسمان کە (عەشتارە).
* دموزی (DUMUZI) تەمووز.

## شتێك لەمێژووی ئاوابوون

**• پەرێز**

گیا بڵند بوو، لە کڵاوەی چۆکی دەدا..
لە وەرزی ئاوس بوون دا
ڕەگەکان هاتنەوە بەر با..



**• ڕەوڕەوەی وەستان**

لەسەر بەردی سێڕیانەکە دانیشتووە
چاوەڕوانی (بەیان) دەکا..
گەلێ جار (بەیان) هاتووە
تریفە بارانی کردووە و
تێشتی لەگەڵدا خواردووە..
ئەو هەر لەسەر بەردەکەیەو نابزوێ!
وشت بووە!
چاوەڕوانی (بەیان) دەکا..

**• ئاڵ بردنەوە**

ئاوێنەکان بەدیوارەوە شکاون..
هەتاو ڕووتە، سایە پۆشتە
پێینگانی کچی ئاسمان
داری حەسرەتی لێ ڕوواوە.

• **خوێنکێش**

لە ناوقەدەوە پێکراوە..
تنۆکێ خوێنی لێ نەهاتووە
شاڵی پشتی تەمەنیشی هەڵمشتووە.

• **تەنافباز**

وەکو پەمۆ:
لە قۆزاخەو
لە مەکینەو
لە دارهەنەیشدا دەژی..
تا ئەوەی لە پەرداخێکیش نقوم دەبێ
دەریا هەستێ ناگاتە گوێزینگانی.



**• برایەتی**

ئەوان تینی کورەی دەفیو
ئێمە شەختە..
ئەوان گیا
ئێمەش بەرخی دوو باقە گیا...

**• زایەڵەی بێ دەنگی**

لەو ساتەوە سوژنی
لە بن پیلی شەوەی ڕۆژگار ڕاکردووە؛
هاوار ئەکا..
کەس دیار نییە
(با) وەستاوە!
ئەویش بە دەنگە دەنگی خۆی
نەوەک هەر کەڕ، لاڵیش بووە..



**• پانکی مێشک**

بیری نایێ بارانێ گرتبێتیەوە
نەی دیوە خوێنی تێ بگەڕێ!
پانکی سەرچاوەی گومڕایی،
هەر لە دووڕا ماکی کەڕووی پێوە دیارە.

**• کێلوکە**

تاک تاک..
شێوەی جریوەی پاساری
تاک تاک
شێوەی زەبوونی و ناچاری
تاک تاک
کە تەنیایی هەر بۆ خوایە.

**• خێزەڵانی سنگەکان**

ئەوە هەناسەدان نەبوو
ئەوە ڕمانی چیابوو..
چەخماخەی هەورە تریشقە و
فڕینی هەموو چۆلەکەو کۆترەکانی دنیا بوو..
ئەوە هەناسەدان نەبوو.

*** بانگۆش**

ئێستا مناڵان
یاری بە باگردێنەکەی دەکەن
دەسکەکەشی کردووە بە شەقەو پێی دەڕوا..
دەرناکەوێ،
چوار وەرزی ساڵ لە ماڵێیە...

**1989/9**



# پەراوێز

-بەشی یەکەم-

**(1)** تنۆکێکە

تنۆکێ فرمێسکی ناکام؛
ماسی مەلەی تێدا دەکەن
چرا دەچنەوە باڵ یەکتر.
شاعیر ڕەنگەکان ون دەکا..
تنۆکێ فرمێسکی ناکام؛
بیابانیش تینوویێتی خۆی پێ دەشکێنێ..



**(2)** ئێمە مرۆڤی هەتاوین
خەڵاتمان کفنە
چوار هەزار و پێنج سەد ساڵە
کفنمان زەرد هەڵناگەڕێ..
با بەسەر لاشەی بێ گیانی شەوی دادەین،
کێڵ بینەوە.
ـ دیسان؟
ـ دیسان.
ـ لە نووکەوە؟
ـ لە نووکەوە..!

(3) ماوی؟
ـ ماوم.
یەکەم جار نییە ڕەشەبا
سێبەری بەفر لوول بدا..
بە نەشئەی تاسانمان دەژین
نابین بە بارانی ناوەخت..

(4) جارێکی تر هاتەوە بەر پەنجەرەکەم..
لەوەتەی لێک دابڕاوین،
لێم ناگەڕێ!!
هەموو شەوێ، مۆمێکی بەدەستەوەیە
لە پەنجەرەڕا
شیعرپژێنی ژوورەکەم دەکا.

(5) حەقیقەتێکی لە نێرگز ون بووی
ئاگر و بەفری نێو دڵی مێژووی
نە ئاگر بەفر دەتوێنێتەوە.
نە بەفر ئاگر دەکوژێنێتەوە.

**1986/4**





# پەراوێز

-بەشی دووەم-

**(1)** گەڵای سەوز
لە قەدی میدۆزدا بوو بە بەرد.
کێ توانی
وەک گەڵای ناوقەدی کتێبێک
بچێتە قەدی مێژووەوە؟
کە هاتی سەوز بووی
نەهاتبای چاتر بوو!



**(2)** خەونی دی!
مێشکی پەرتی سەردەم بوو،
لە هەموو خەرمانێ بارووتی..
خەونی دی؛
سینەی ڕووت و دادڕاوی بەر لێزمەی تەزرەبوو..
خەونی دی؛
مەلەی لە نێو کادا دەکرد.

**(3)** ڕۆیی و وتی:
لە تەنکاوان نامێنمەوە..
هەموو ئاشنای شەپۆلانین
هەموو ئاشنای مێژووماڵکی کەڵەکانین.
ڕۆیی و وتی و نەهاتەوە..

**(4)** فاندۆم، نەباران بوو، نە گوڵەگەنم
بۆ مۆزەخانەیش دەستی نەدەدا مامۆستا (کۆربێ)!
فاندۆم کۆتەڵێک بوو، لەگەڵ نووچداندا ڕاقەنا.

**(5)** کێ تاڵاوی خوارد؟
کێ تاڵاوی خخو؟؟
کێ تاڵاو..؟؟؟
کێ تاڵ..؟؟؟؟
کێ ت..؟؟؟؟؟
ک...؟؟؟؟؟؟؟

**(6)** تا لێی بڕا سەمای بۆ تارماییەکان کرد..
تا تێی دابوو، بانگی ڕاهێشت:
چۆلەکەیش بە قسە هاتن.
تا تێی دابوو..

**(7)** نەوای هێشووە بزرکاوەکان
بوو بە نووریێ
هێزی لە خۆر و مانگ بڕی
گیاو گۆلی وەجۆش هێنا
بەسەر چاک و خراپ دا باری
نەوای هێشووە بزرکاوەکان
لە تەمی ڕۆژگاردا ون بوو...



**(8)** پاساری گەڵایان هەڵوەری..
درەخت پەڕ کران..
شەو چرای ڕۆژتە، پەنای چی؟
گیانەڵای ناختە، هانای چی؟!











**(9)** ئۆسنابرۆک، شارەگوندێک بوو
بە هەزاران منداڵی بۆ شەڕ پێگەیاند
لە دواییشدا یەکێک لەو هەزارە زیلە؛
وتی: بۆ؟
ئێستا ئۆسنابرۆک بەو مێرمنداڵە دەناسرێتەوە..
ئێستا ئۆسنابرۆک لە شەرمان دەدرەوشێتەوە..

**(10)** دیسان باران دایکردبوو
لە تەنتەنەی تەنیایی دا؛
نوزەی دەهات:
تۆ ئاسمانی..
تۆ بەیانی..
تۆ گونجانی ناو ڕۆژگاری نەگونجانی.

**(11)** دوکەڵکێشەکان خامۆش بوون.
هەوا هەناسەبڕ کرابوو..
لەو دوورەڕا چۆن بزانم
گوندییەکان نووستوون یا بێدار..؟



**(12)** شاملو
شاعیرێکی ئەم جیهانی (سێیەمە!)
ڕۆژێ لە ڕۆژان وتی:
«ئەگەر سپی دارەکەم چرۆ دەرکا،
باڵندە ڕەشەکە هەڵدەفڕێ
ئەگەر باڵندە ڕەشەکەیش بڕوا،
سپی دارم چرۆ دەکا..»

**(13)** فێر بووە وەختێ پڕ دەبێ
تێ هەڵکا ستران و لاوکان بچڕێ..
تۆ ئێستا دەبینی لاوک و سترانمان لە خۆمان زۆرترن.



**(14)** ئەدرەسم هێشتاکە
ئەدرەسی جارانە:
بناوانی ڕەشەبا
ئەو دیوی ڕۆهەڵاتی مردن.

**1989/1988**






## خەرەندی گوێیەکان

زامەکانی ئیسپاڕتا
بە پۆلیسی نهێنی سارێژ نەبوون.
گۆلی وانێ
بە چەنگێ خوری دروست بوو!
دیکتاتۆر،
لە سایەی ئەو گوێیانەدا
گوریسی لە ژێر دنیادا ڕاخستووە..

هاوڕێ!
ئەوەتا ڕۆژگار بووە بە گلۆڵەیەک تێل دڕ
لەگەڵ ئەوەشدا کۆترەکان دوای دەکەون!
لە چەند تنۆکە خوێنێکی پەرش و بڵاو بەدەر
بەدوای خۆیان جێناهێڵن..

مێژوو سارنجخانە نییە..
چەند وردە خەمێک نییە..
ئۆتۆمبێل لێخوڕینیش نییە..
مێژوو بڵێسەیە هاوڕێ!
ڕوناهی دەدا... دەشسووتێنێ
مێژوو ڕسکانە، پانۆرامای هەڵەو خەتاکانە..
وەختی ئەوە هاتووە هاوڕێ!
دەمامکەکانت فڕێ دەی
شتەکان! با هەمووی بۆ تۆ بێ
مەسەلەیەک نییە..
من کولێرەیەک و
گۆرانیەکەمم بەسە..



تۆ کە ناتوانی گۆرانیەکەم دەستەمۆ بکەی
کولێرەکەشم لێ مەدزە.. هاوڕێ!
کولێرەکەم لێ مەدزە،
کە ناتوانی گۆرانیەکەم دەستەمۆ بکەی.

**1992/6/29**



کوژانەوەی سەرچاوەکان



## کوژانەوەی سەرچاوەکان

(...؟)
بەگڕەبای کۆچ هاتن
داگیرسابوون شەوقیان دەدا..

به بای ناخیان هەڵدەبوون و دەکوژانەوە
بە ناو دڵەڕاوکێی سەردەمی
هەورە ئاوتێنەزاوەکان شۆڕ بوونەوە..
شیعریان بەپێش کەوتبوو:
هاتن کورتان بۆ کێچ بکەن..
کاغەزی سپی بخوێننەوە..
تا گەیشتنەوە سەر ساغە..!
نە پیاو نە ژن
ڕووی خۆیان نەبینیەوە..
وەختێ گۆڕیان هەڵدانەوە
چەند پیرۆزەو خەنجەری ژەنگاویان لێ بەدەرکەوت
ناویان لێ نان؛ تاوان!



# مۆدلیانی

ڕووبارەکانی دۆزەخ
لە ژووری گریانەوە دێن..
شوێنەواری هیچ ڕێگایێ دیار نییە؛

دارستان و بڵندایی پیلیان تێک هەڵکێشاوە.
تۆ هەر بڵێ و بڵێرەوە!!
کەس بە نرخی باوەڕێنیش ئاوڕی لێ ناداتەوە.
کێ ماسی لە ناو ئاو دەکڕێ؟
تۆ هەر بڵێ!!
(لیڤۆرنۆ) نوقمی کوێرایی دەریا بووە
دانی لە دەمامکەکانت گرساندووە.

«ئای ئیتاڵیای خۆشەویستم!»
کەس نییە لە ڕەشە شەوی پاریس دا
چرایەکی بۆ هەڵبکا..
(جین)یش جۆگەی ڕووباری دۆزەخەکەیە
لە ژووری گریانی دانتی دەکاتەوە..



هاوارێکی بێ هودەیە.
تەمەنای مەرگی دووەمە.

«ئای ئیتاڵیای خۆشەویست»!
مەرگ کەنارەکانیشی ڕەش کردەوە..
باسکی مێژوویان باداوە
کەس نییە سەرەداوەکان گرێ داتەوە
ئیتاڵیای خۆشەویستم!

**شوباتی/** 1989






## تۆ

تۆ.. ژانێکی تری ناخی ئەفسانەکانی
تۆ..
بۆ من:
تانەی چاوی
شەختەی رێگا
خانەی خەفەت.

بۆ ئەوانیش:
پەیژەی نەشئە
تەنکاوی دەریا
هەواری ئاسوودەیی.

تۆ.. هەواڵێکی خۆشی..
بێ مانگە دەسکردەکان
بێ پەیک دەگەیتە جێ.
بەڵام تۆ..
وەک چڵەکانی ڕۆژپەڕ
حەقیقەتێکی بۆشی..
تاڵ تاڵ
بێ جیاوازی،
بەسەر ئاسمانەی ڕەوزەنی
هەموو (من)ـەکان دا دەباری..



تۆ..
لە نێوان (ئا)و (نەء)دا
پرسیارێکی،
لە قوڵایی چاخە بەردینەکانەوە
هەڵداشتراویە خوار..
بەرد نییە.. سەرت پێ نەکەوتبێ
دار نییە.. لە سنگت نەچەقیبێ
ڕووبار نییە.. نەیبردبی..

تۆ..
تۆ لە یەک کاتدا نهێنی چۆلپەرستی و
دلڕەقی شارستانیەت..
تۆ..
چرای بەر ئاستانەی پەرستگای
هەردەمەو لە دەستی کاهینێک دای.

تۆ ڕوناهی دۆزەخی
گوناهەکان جوانتر دەردەخەی..
تۆ تاریکایی بەهەشتی
پاکیزەیی و باشییەکان حەشار ئەدەی..



تۆ
تۆ ژانی.. بەڵام ژانێکی تر
تۆ کچینی مێژووی.. تۆ
تۆ..
ئاخ.. تۆ
تۆ.. بە هەر حاڵ (تۆ)ی!

**1993/4/23**





# چەند کۆتەڵێکی جەنازەیی

**(1)**

هەر چیمان کرد
بەشی ئارەزووی
شازادە تەنپەروەرەکانی نەکرد.
هەر چیمان کرد بۆ (سبەی)
(ئەمڕۆ) لەسەر شەقامە خوارەکانی سەدەی بیستەم
وەک چۆلەکەیەکی سڕ یاری پێ دەکەن...
وەرە با پەیمانێک لەگەڵ ئەشکەوتە کوێرەکان مۆر بکەین.
وەرە با لە کۆتەڵی بێ تارای ئەبەدیەتدا بنووین.

**(2)**

ئێمە ئاسمانمان
بۆ کۆتەڵی یادگاریی ئەوانە.
ئێمە خۆرمان
بۆ باخچە هەڵواسراوەکانی ئەوانە..
ئێمە مانگمان
ئەستێرەکانمان
بۆ مەداری بەتاڵی ئەوانە..



**(3)**

داریان لەسەر بەردی دەوروبەر نەهێشت.
کۆتکی بەتاڵیان پێ کوتاین.
لە ڕۆژگارە هەرە ڕووناکەکان
چرایان پێ داگیرساندین..
هەزارڕیانکیان بۆ دروست کردین،
پێیان وتین: فەرموون چاوەڕوان بن!
لەو ساوە خۆمان لێ ون بووە..
لەو ساوە چاوەڕێی خۆمان دەکەین.

**(4)**

بەرەو من بێی
هەموو شتێکت دەست دەکەوێ
هەموو شتێک،
بە (مردن)یشەوە..
کە ئەوە ساڵەهایە لە شەڕ بەجێ ماوە!
بەرەو من بێی،
دەتوانی بەرامبەری دابنیشی
یا لەگەڵی بئاخڤێی
حیکایەت و سەربردەت بۆ بگێڕێتەوە..
مەگەر ئەو تەواوی چیرۆکی (پێشێل کردنی گوڵەکان)ت
بۆ باس بکا.



**(5)**

ئەو هەموو چاوانە..
ئەو هەموو گوێیانە..
ئەو هەموو زمانانە..
دەستم بوو.. خواردیان
قاچم بوو.. خواردیان
چاوم بوو.. کۆڵیان
ئەوەتا تەمەنی بێ کلاورۆژنەو بێ پەنجەرەو بەژواریشم.
شەڕی پێدا دێتە خوار..
ئاژاوەی لەبەر دەڕوا..
هاتبووم بڵێم:
ئەم درەختە بەشێکە لە مێژووی
هەتاوو سێبەرمان
پێویستە بمێنێ.
دەستم بوو. خواردیان
قاچم بوو.. خواردیان.
چاوم بوو.. کۆڵیان
ئەو هەموو چاوانە..
ئەو هەموو گوێیانە..
ئەو هەموو زمانانە..

**(6)**

لەم ئەلبومەدا یادگاری منالّیتان کوشت
لێرە، لەم سنوورەدا:
گۆرانییەکانمان،
لە شەڕێکی دەستەویەخەی نابەرابەردا تیاچوون.
لە تۆنێلّە تاریکەکانی ئەم پایتەختەدا
شیعرەکان،
شینیان بۆ پالّەوانەکانمان گێڕا.
پێمانەوە دیارە؛
هەموو فریشتەو شەیتانەکانمان تۆراندووە
تا لە ئەفسانەیەکی سیلاکبوودا دەرکەوین..



**(7)**

بەداخەوە ڕایدەگەیێنم:
گولّەگەنمەکان پیر بوون
دەم و چاو لۆچ.. ماندوو
وەک لەشکرێک لە شەڕدا
بەدۆڕاوی گەڕابنەوە..
لە گوێی ڕووبارەکان کۆبوونەتەوە
نوێژ بۆ شارای دزراو دەکەن..

**1993/8**






## باوێشکەکانی مێژوو

لێوە بە بارەکان ژەهرن، کەف هەڵدەدەن
شەپۆلە ئارامەکان سەرشێتی هەڵیاندەلووشێ
ئەوە جارێکی تر منم لە چاوەڕوانی خۆمدا:
ئاسمانم بریندار..
ئەستێرەم نەوی..
خەونەکانم لە بێخەوە هەڵدەکەنم.

ئەوە جارێکی تر منم
چڕنوک لە کەنارەکانم دەنێم
گلێنەکانم دەکۆڵم.
جارێکی تر منم؛
سنووری نیشتمانی ناو گریان و پێکەنینم
دەکێشمەوە:
لە باکوورەوە: شەڕ
لە باشوورەوە: شەڕ
لە ڕۆژهەڵاتەوە: شەڕ
لە ڕۆژئاواوە: شەڕ
............
............
............
............
............



تەماشا!
لە داخی هاوەن و ئاڕ پی جی بێهودەی ئێوەدا
ڕەشەبایش هەڵناکا..!
تەماشا!
هەور چۆن لە کلاوڕۆژنەدا ون بووە
گوڵەگەنم بێ دادڕەس
وەک خونچەی مەیدانی شەڕگەکان
یەک یەک
دوو دوو
دە دە
ڕادەقەنێن،
بەلادادێن و دەسووتێن..
تەماشا!

.................
.................
.................

تەماشا
چۆن لەسەر مێزەکان
بارۆکە بەگیانی کەچەڵیان وەدەکەن..
سەبیلەی شەیتانن...؟
ئەشکەوتی چیاشمان
لە شەرمان چاویان لێک ناوە...
تەماشا!



مەدەد؛ ئەی چرای ڕۆشنی
زەمانی شەوڕەو قوڵنگ و خەنجەر!
مەدەد؛ ئەی ئاشیانەی سۆز و سەرچاوەی ئاوەدان!
مەدەد؛ ئەی کێڵگەی ئارخەیانی مەدەد...!
مەدەد؛ ئەی خێوەتی ئاودامانی ڕووبار و خەرمانەو
مناڵان

مەدەد...
مەدەد...
درەختمان رووت..
ڕۆحمان بیابان..
نە ڕۆژهەڵاتمان، ڕۆژهەڵات
نە ڕۆژئاوامان، ڕۆژئاوا..
مەدەد؛ ئەی تەجەللای ئەستێرەی پەیمانی موقەدەس!
مەدەد...!
مەدەد...!

دیسان لێوە بە بارەکان ژەهرن، کەف هەڵئەدەن
دیسان شەپۆلە ئارامەکان سەرشێتی هەڵیاندەلووشێ.
مەدەد

م
ە
د
ە
د

..............
..............
..............



(ئاسیا)!

ئاسیا، ئەی ئاسیای
سووتان و
چاوەڕوانی و
مەنفا!
ئاسیا، ئەی ئاسیای ئەفسانەو شیعرو داستانی نەمری!
ئاسیا، ئەی ئاسیای کێڵگەی هەتاو و بیرە نەوت!
لە دەرگای شەڕ بەدەر..
لە چرکەی چەک زیاتر
چیدیمان لێت نەدی
ئەی ئاسیای
سووتان و
چاوەڕوانی و
مەنفا!

.........
.........

ئافەرین!
ئافەرین چوار هەزار گوندی وێران..!
ئافەرین سەدو هەشتا و ئەوەندە هەزاری ئەنفال..
ئافەرین کیمیاوی!
ڕاگواستن
زیندان و ئیعدام... ئافەرین!



ئافەرین ئارایشی جامخانەی برسیەتی و
قاتی و
پاتاڵ..... ئافەرین...!
ئافەرین فیشەکەشێتەی شەوانی
ویسکی و
برێندی و ڤۆدگا!
ئافەرین ئاگری بن کا.. ئافەرین..!
ئافەرین یەخەی درەوشاوە
پێلاوی بریقەدار...
ئافەرین کۆنگرەی کریستاڵ..
ئافەرین سمێڵی بابڕ..
ئافەرین سەرپۆشی حەقیقەت... ئافەرین..!!
..................
..................
..................

وەرن شەهیدەکان!
برسیەکان!
تینووەکان!
ڕەنج بە خەسارە دڵشکاوەکان...!
وەرن ڕەبەن و کچە بێ مرادەکان... وەرن!
وەرن بەڵکو ئاسوودەییەکتان
لە بانیژە چکۆلەکەی شیعر دەسکەوێتەوە.



وەرن...!
وەرن...!
هەر ئەو گۆشە بچووکە ماوە دەستی؛
دزو جەردەو/ بازرگانی شەڕو/ سەرسەری و
شەللاتی و/ هەلپەرست و/ بەرتیل خۆرو/
سۆزانی و/ تیرۆریست و/ ماستاو چی و/
هێزی (RR)ی نەگاتێ..

وەرن...وەرن!
هەر ئەو گۆشە بچووکە ماوە
هەناسەیەکی لێ مابێ
قومە ئاوێک و
لەتە نانێک و
دڵنەوایی و
زەردەخەنەیەکی تێدا بێ.

وەرن بەڵکو ئاسوودەییەکتان

لە بانیژە چکۆلەکەی شیعر دەسکەوێتەوە...



وەرن... وەرن...!
با ئەوانیش،
لەبەر ئاستانەی سەدەی بیست و یەکەمدا
لەناو باوێشکەکانیاندا بنوون...

**مایسی/ 1994**

# له تڕپه‌ی دڵ کورت تر

ئه‌وه‌بوو قه‌ڵای سه‌رچڵی و ڕسکانمان؟
ئه‌وه‌بوو خه‌ون و چراوگی ڕێگامان؟

(مانگ ـ ێکمان هه‌بوو
هه‌ندێ جار نان و
هه‌ندێ جار په‌نا
ئاسمان لێی به تاڵان بردین.
ئێستا بێ نان و بێ په‌ناین.)

...........
...........
...........؟؟



نیو سه‌ده؛
ڕووته‌ڵه،
چه‌ترمان له سێبه‌ر هه‌ڵداوه
هه‌نیه‌مان ئاره‌قه‌ی گوناهی پێدا دێته خوار...
نیو سه‌ده..

نیو سەدەی خیزەڵان...
بە چرنۆک؛
بە تاوی فڕین و بە خوێنی ئومێد..
بێدەنگیمان بە هاوارە گومڕاکانەوە دیار..



نیو سەدە،
دورگەیەک بووین دوور....
هەموو دنیامان لە وێنەی گۆزەیەکی شکاودا دەبینی.

(هەبوو پرچی دڕنیەوە
هەشبوو دایدەهێنا..
ئێمەش بۆ ژیان. بە دوای
خۆڵەمێشی سووتانی خۆمان ئەگەڕاین..
بکوژی ـ حسێن ـ
هەموو پاکیزەیی دنیای
لە کراسێکی سووردا
بە دڕندەی چیایان سپارد...)

.........
......؟؟

بەردیش پاڵی بە بەرد داوە
ڕووبار لە چاوتا خنکاوە..
بمپارێزە!
بمپارێزە ئەی شوورەی خۆشەویستی
شوورەی ئەبەدیەت..

بمپارێزە!
هاوارێکی ترم پێ نەماوە....
بم
پا
رێ
زە.....
1994/7